# ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن

لێکۆڵینەوەیەکی وشەسازییە بەرێگای داڕشتن و لێکدان

د. ڕەفیق محەمەد شوانی

# ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن

## لێکۆڵینەوەیەکی وشەسازییە بە رێگای داڕشتن و لێکدان

د. رەفیق محەمەد شوانی

# ناوەڕۆک

## كورتەی باس (ملخص البحث)

ئەو باسەی لە دوو توێی ئەم نووسینەدایە نامەیـەكی ماجـستێرە دەربـارەی ئـەو وشانەی وەك (ناوی بكەر، ناوی بەركار، ناوی چاوگ، ناوی جێگا، ناوی ئامێر) كە بە ڕێگای ڕۆنان لە چاوگەوە وەردەگیرێن. بابەتی تر هەن لە چاوگەوە پێكدەهێنرێن، بەلاّم باسەكەی ئێمە تەنها ئەو بابەتانەی ناومان بردن دەگرێتە خـۆی، كـە بـەلای ئێمـەوە تائێستا بە شێوەیەكی فراوان لێیان نەكۆلّراوەتەوە یـا تـەنها هەنـدێكیان بەنێوەچـلّی باسكراون.

ئێمە لەم لێكۆلّینەوەیەماندا بە سێ بـەش لێیـان دواویـن. لـە بەشـی یەكەمـدا زۆربەی ئەو سەرچاوانەی لەو بارەیەوە دواون هەلّمان سـەنگاندوون و زۆر هەولّمانـداوە لە ئرخاندنیاندا ڕێگای زانستی بگرینە بەر، بەوەی كە لایەنی كەم و كوڕی و ناتەواوی و بۆچوونی ناڕاستی و ئەو سەرچاوانە دەستنیشان بكەین و بیان خەینەڕوو، هـەروەها ڕاستیان بكەینەوە و بە بەلّگەو و پـشت بـە بۆچـوونی ڕاسـتی خۆمـان و سەرچـاوەی بەكەلّك ببەستین. لایەنی باش و ڕاستیان بۆ سـوود لێ وەرگرتنـی لێكۆلّینەوەكـەمان وەرگرین بـۆ فـراوان كـردن و دەولّەمەنـدكردنی باسـە سـەرەكییەكەمان. لـەم ڕووەوە سەرچاوەیەك مەگەر هەر دەست نەكەوتبێت، سا لە هەموویانەوە دواوین.

لە بەشی دووەمیشدا هاتووین بابەت بە بابەت لێی دواوین و هەر بابەتێكمان كـە تائێستا پێناسەیەكی ڕاستی بـۆ نـەكراوە، بـەپێی چـەمكی بابەتەكـە و لایەنـەكانی پێناسەیەكمان بۆ سازداوە. پاشان هاتووین ڕێگای دروستبوونیانمان بـە لێدوانـەوە لـە

جۆری چاوگەکەی و لە ڕەگ و قەد و پاشگر و پێشگرەکەی، دەستووریکمان بە بەڵگە و نموونەوە، لە شیعر و پەخشانی شاعیران و نووسەران هێناوەتە کایەوە، کە تائێستا بە تەواوی روون نەکرابوونەوە. هەموو ئەو بابەتانەی سەرەوە (ناوی بەرکار)یان لێ دەرچێت لەگەڵ یەك ریژەی (ناوی بکەر و ناوی چاوگ)، کە لە قەدی چاوگەوە وەردەگیرێن ئیتر هەموو رێژە و شێوەکانیان لە ڕەگی چاوگ و پێشگر و پاشگرەوە و لێکدراوەکانیشیان لە ڕەگی چاوگەوە بەلابردنی نیشانەی چاوگەکانیان دروست دەبن. لە دوای هەر بابەتێکیانەوە هەموو ئەو ئەرك و تایبەتێتی و بەکارهێنانەی هەیانە لەڕووی لایەنی جیاوازی وشە سازییەوە لەڕووی بوونیان بەزاراوە و ئیدیەم و وەرگرتنی نیشانەی کۆ و ناسراوی و نەناسراوی و وەرگرتنی پاشگری (ی) ناوی واتاییەوە خستۆتە پێش چاو. لە بەشی سێیەمدا بەکورتی پوختەی لێکۆڵینەوەکانی بەشی یەکەم و دووەمی نامەکەمان وەکو ئەنجامی باس و بۆچوونەکانی نووسەران دەربارەی بابەتەکان و بۆچوونی خۆم و ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی خۆم دەربارەی بەشی دووەم خستۆتە پێش چاو.

نامەکە بە لیستەی ئەو سەرچاوانەی کە سوودمان بۆ لێکۆڵینەوەکە لێ وەرگرتووە کۆتایی دێت.

# پێشەکی

ئەم نامەیە هەوڵدانێکە بۆ شیکردنەوەی زمانی کوردی لەڕووی وشەسازی (مۆرفۆلۆژی)یەوە دەربارەی ئەو وشانەیە کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن، بە (ناوی بکەر، ناوی بەرکار، ناوی چاوگ، ناوی جێگا، ناوی ئامێر) ناودەبرێن. باسەکەمان بەشێوە زمانی وێژەیی (کرمانجی خواروو)ە.

گرنگی ئەم بابەتانە لەوەدایە کە بە رێگای رۆنانەوە لەچاوگەوە وەردەگیرێن و ئەوە دەسەلمێنن کە بەرێگای رۆنانیش لە چاوگەوە زۆر بابەتی جیاواز جیاوازی بەهۆی پێشگر و پاشگرەوە شان بەشانی لێکدان لێ پێکدەهێنرێت و وشە تازە بابەتەکانیش دەچنە ریزی بەشەکانی تری ئاخاوتنەوە. بەمە ڕووندەبێتەوە کە لێکۆڵینەوە و خەریك بوون بە رۆنانەوە دەورێکی چاك دەگێڕێت لە دیاریکردنی یاسا و دەستووری پێکهاتنی وشە لە وشەسازی کوردیدا.

هەرچی ئەو بابەتانەی سەرەوەیە، ئەگەرچی لە زمانەکەماندا دەورێکی چاك دەبینن لەناو بەشەکانی ئاخاوتندا وەکو بابەتی جۆربەجۆر لەناو و ئاوەڵناو و زاراوە لە ئاخاوتن و نووسیندا خۆیان دەنوێنن بەڵام بەداخەوە تائێستا لێکۆڵینەوەی تایبەتی و سەربەخۆ و فراوانیان لەسەر نەکراوە. واتە توێژینەوەی وەها نابینرێ بەرێگای پێکهاتنەوە دەستوورەکانی خستبێتە پێش چاو و ئەو گۆڕانانەی بەسەریاندا دێت دیاری و نیشان کردبێ. کەم لێکۆڵینەوە دەبینین بەتەواوی لەبارەی هەموو ئەو بابەتانەوە یا لەبارەی هەندێکیانیشەوە بەرێکوپێکی کرابێت.

بابەتەکان لەبەربوونی پەیوەندییان بە بابەت و بەشی تری ئاخاوتن و زمانەوە هەڵدەگرن توێژینەوەیان لەسەر ئەنجامبدرێت. ئەم بابەتانە هەڵدەگرن ببنە زاراوە و لایەنێکی زۆرمان لە فەرهەنگی زاراوە سازیدا بۆ بەکارهێنانی بابەتی تازە و داهێنراو لە ژیانی رۆژانەدا دابینبکەن.

نووسەرانی کورد بەگشتی ئەم بابەتانەیان یا فەرامۆش کردووە، یا بەکارتێکردنی زمانی عەرەبی لێیانیان کۆلێوەتەوە، بێ ئەوەی گوێ بدەنە تایبەتێتی زمانی کوردی و رێزمانەکەی. بۆ نموونە تاکە سەرچاوەیەك نەبێت لەبارەی هەموویانەوەی کۆلێوەتەوە، کە ئەویش کەموکوڕی زۆری گرتۆتە باسەکەی. بەڵگەمان لەم بارەیەوە ئەوەیە ئەو رێژە ناوە بکەرییەی کە لە عارەبیدا لە چاوگی تێنەپەڕەوە بەناوی بکەر داناوە، کوردەکانیش بەزۆری بەناوی بکەریان داناوە کە راستێکەی لە تێنەپەڕی گوێزانەوەوە ناوی بکەر و لە تێنەپەڕی رووداینیشەوە ناوی بەرکار پێکدەهێنن. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە دەستووری پێکهاتن و رۆنانی بابەتەکانیان لە جۆری چاوگ و فرمان یا لەڕەگ و قەدی چاوگ و تێکەڵکردنی نیشانە و پێشگر و پاشگر بە تەواوی روون نەکردۆتەوە، کەڕاستێکەی بنەڕەتی لێکۆڵینەوەی وشەسازی پێکدەهێنن و دەستووری پێکهاتنی ئەو بابەتانە دەچەسپێنن. لایەنێکی فەرامۆش کراوی تری ئەم بابەتانە ئەوەیە کەم نووسەر دەبینین لە هەموو بابەتەکانی سەرەوە دوابێت، بەتایبەتی لە (ناوی چاوگ و ناوی جێگا و ناوی ئامێر). خۆ ئەگەر باسیشیان کردبێ لەگەڵ (ناوی واتایی و ئاوەڵفرمانی شوێنی) تێکەڵیان کردووە و لاشیان لە (ناوی ئامێر) نەکردۆتەوە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا لێکۆڵینەوەیەکی نارێك و تێکەڵ دەردەچێت، چونکە ئەوانە هەریەکەی بابەت و باسێکی جیان و سەربەخۆن. ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا هاتووین هەنگاو بە هەنگاو بابەتەکانمان باسکردووە. هەر بابەتێك پێناسەکەیمان دیاریکردووە و پاشان هەموو رێگاکانی پێکهاتنیانمان بە نموونەوە روونکردۆتەوە و وەکو دەستورێك چەسپێنراون. ئەوەشمان لێکداوەتەوە کە ئەو بابەتانە لە چاوگەوە

وەردەگیرێن و چاوگ بنەڕەت و سەرچاوەی پێکهاتن و وەرگرتنیانە، نەك فرمان، چونکە فرمانیش خۆی لە چاوگەوە وەردەگیرێت. ئەمەتا ئێستا لەلایەن نووسەرانەوە ئاشکرا نەکراوە و هەریەکەی بەجۆرێك بابەتەکەی بێ روونکردنەوە و لێکۆڵینەوە یا لە چاوگەوە یا لە فرمانەوە باسکردووە. زۆربەی نووسەران لایەنی بەکارهێنانی ئەم بابەتانەیان، بەتایبەتی (ناوی بکەر و ناوی بەرکار) دەسنیشان نەکردووە، کە وەکو ناویش و ئاوەڵناویش بەکاردێن. هەندێکیان بەناو و هەندێکیان بە ئاوەڵناویان زانیوە. ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەماندا هەولّمان داوە هەموو گیروگرفتێکی ئەم بابەتانە چارەسەر کردبێ و بەڵگە و نموونەمان لە فۆلکلۆر و نموونەی زیندووی زمانەکەمانەوە هێناوەتەوە. بۆ هەر بابەتێکیان لە کۆتایی باسەکەیانەوە هەموو ئەو تایبەتێتییانەی هەیانە بە نموونەوە خراونەتەڕوو وەك ئەرك و شێوەی بەکارهێنانیان.

**رەفیق محەمەد محێدین شوانی**

ئەو سەرچاوە و کتێبە ڕێزمانیانەی لە بارەی ڕێزمانی کوردییەوە دواون ئەگەر چی لەناو باسەکانیاندا لایان لەو جۆرە وشانەی وەك (ناوی بکەر، ناوی بەرکار، ناوی چاوگ، ناوی جێگا، ناوی ئامێر) کردۆتەوە، کە جێ مەبەستی لێکۆڵینەوەمانە، بەڵام بەگشتی نیوە چڵ و بەکەلێندار بەرچاو دەکەون، چونکە جۆرەکانی تریان فەرامۆش کردووە یا بە نارێکی و تێکەڵ و پێکەڵ لە بارەیانەوە لێکۆڵینەوەیان کردووە. هەندێکیان بە تەواوی ڕایان نەگەیاندووە.

ئەم جۆرە وشانەی کە سەر بە بەشێکی ئاخاوتنن لە چاوگەوە وەردەگیرێن و تێکڕاش لەگەڵ ئەوانەی لە ناوەوە پێکهاتوون تێکەڵکراون.

لێرەدا ئێمە لە بارەی ئەو کارانەوە هەڵسەنگاندنمان ئەنجامدەدەین. کارێکی کە ڕاست و زانستانە بێت بۆ فراوانکردنی لێکۆڵینەوەکەمان دەیخەینەڕوو، ئەوەشی کە هەڵە و کەموکوڕی و نازانستانە بێت ڕاستیدەکەینەوە.

لەم لێکۆڵینەوەیەماندا لە کۆنەوە بۆ تازە، سەرنجەکانمان لە کۆنترین سەرچاوەوە بەپێی مێژووی دەرچوونیان یەك لە دوای یەکترەوە چ لە کتێب و چ لە گۆڤار و چ لە ڕۆژنامەوە بێت دەربارەی ئەو بابەتانەی کە لەسەرەوە نیشانماندان، دەخەینەڕوو.

یەکەم کتێبی ڕێزمانی کوردی (مختصر صرف ونحوی کوردی)ی مامۆستا سەعید صدقی کە بەشەکانی ئاخاوتنی بەسەر پێنج بەشی وەك ((اسم، صفت، ضمیر، فرمان، ادات))دا دابەشی کردووە[1] بەگشتی وەکو یەکەم سەرچاوە ڕێکوپێکە و بەردی بناغەی ڕێزمانی کوردییە.

بۆ دەربڕینی سەرنجەکانمان لە بارەی ئەم کتێبەوە، ڕوو دەکەینە ئەو بابەتانەی لەسەرەوە خستماننەڕوو نووسەر بە پێناسەیەك دەستی بەباسکردنی (ناوی بکەر) کردووە کە تێیدا دەڵێ: ((اسم فاعیل – اسمیکە دلالت بکا لە ایش کر))[2]. ئەم پێناسەیە بکەری ئاسایی دەگرێتەوە، نەك (ناوی بکەر) کە لە چاوگەوە وەردەگیرێ و

---

(1) سەعید صدقی، مختصر صرف ونحوی کوردی، بەغدا، ل 6.

(2) سەرچاوەی پێشوو، ل 19.

لایەنی بکەرێتی (فاعیلیەت)یان بـەهێزە و بـەهۆی ئـەو کـارە بەردەوامـەی پێـوەی بوونەتە ناوی بکەر، سیفەتێکی هەمیشەیی و توانایەکی تایبەتییان بەخۆوە گرتـووە. مامۆستا راستی بۆچووە کـە لـە چـاوگی تێنەپـەڕەوە بـەلادانی (ن)ەکـەی و دانـانی پاشگری (و) ناوی بکەر دروسـتدەبێ، ئـەم (و-W)ەی کـە مامۆسـتا داینـاوە تـەنها دەچێتە سەر قەدی چاوگی[3] (ئەلفی و یائی). خۆ ئەگـەر (تـائی و دالی) بـن بـەدوو (وو-ū) دەنووسرێن، وەك (نوستوو، رۆیشتوو). لەگـەڵ ئەوەشـدا ئەمـە بـۆ ئەوکاتـە بەهەڵە دانانرێت، چونکە هـیچ سەرچـاوەیەکی لەبەردەسـتا نـەبووە. دیـسان راسـتی پێکاوە کە (ناوی بکەر) لە چاوگی داڕێـژراوەوە بـەلادانی (ن) چـاوگەکە پەیـدادەبێ، وەك ((هەڵچوو — لاچوو)) (ل20).

بەلاّم بەشێوەی سادەیی کە لە قەدی چاوگ و پاشگری (ە)ەوە ناوی بکەری (بووە، چووە)ی وەرگرتووە لەبەر ناوێزەیی چاوگی (بوون، چوون) لەڕووی دەستووری ڕێزمانێوە و تێکـەڵ کردنـی ئـەم ڕێـژە نـاوە بکەرییـە لەگـەڵ فرمـانی (رابـردووی تـەواو)دا دروستنابێت. ئەگەر چی ئەمە دەستورێکە، بەهۆیـەوە دەتـوانین بـەزۆری لـە چـاوگە تێنەپەڕەکانی دییەوە (ناوی بکەر)یـان لێـوە هـەڵێنجین، وەك (لێکەوتـە، تێکەوتـە، پەککەوتە، رۆچوو). دوای ئەمە ئەوەی دەرخستووە کە لە چاوگە تێپەڕەکانەوە چـەند شێوەیەکی پێکهاتن و داڕشتنی ئەم نـاوە بکەریانـەی لـە پێـشگر و پاشـگرو ڕەگـی چاوگەوە خستۆتەڕوو و نموونەشی لەو چاوگانەوە کە لە تێنەپەڕەوە کراون بە تێپەر (بێ ئەوەی خۆی باسی ئەم گۆڕانە بکات بەلاّم نموونەکانی لەو بارەیەوەن) وەك نموونـەکانی ((نانکەر، کاغزنووس، معاشخۆر، تاجبەخش، کلاّو رفێن، کتێبدڕێن، سـفرە دڕ، بـار بەسـت، فەرشـراخەر))ی[4] هێناوەتـەوە (بڕوانـە لاپـەڕە:20). بـەلای مامۆسـتاوە

(3) قەدی چاوگ بە فرێدانی نونی چاوگەکەی پێکدێت و دەتوانین فرمانی رابردوو، ناوی بکەر، ناوی بەرکار لێوە دروستبکەین. رەگی چاوگ بە فرێدانی (ن)ی چـاوگەکە و دەنگەکـەی پێـشی پێـدێت. ناوێزەشیان تێدایە.

(4) ئەو نموونانەی بەپێی ڕێنووسی کۆن بوون لە کتێبەکەدا، من بەڕێنووسی تازە دەیان نووسم.

نموونەکانی ((باربەست، فەرشراخەر)) لەگەڵ دەستووری ئەوانی تردا لە ڕۆنانی ناوی بکەردا ڕێکناکەون، چونکە بەلایەوە دەبێ بەپێی دەستوور ((باربەس، فەرش و راخەر)) بێت، کە لە چاوگی (بەستن، خستن)ن، راستێکەی (بەستان)ە و نەك ((بەستن)). ناوە بکەرێکەشی لەگەڵ دەستووردا رێك دەکەوێت و بەڵگەشمان نموونەکەی مامۆستا خۆیەتی کە ((بار بەست))ە، بەلاّم ((راخستن)) رەگەکەی لە وەرگرتندا کە(خە)یە، وەکو مامۆستا دەڵێ وایە پاش فڕێدانی نونی چاوگ و پیتەکەی پێشی هێشتا دەنگی /س/ دەمێنێتەوە و ناوە بکەرێکەشی (فەرش راخەر)ە. بەلاّم شێوەی پێکهاتنەکەی روون نەکردۆتەوە، کە بریتییە لە ڕەگی (خە+ەر)ی نیشانەی بکەری و نەمان و تێچوونی دەنگی (ە)ێکیان، چونکە لە زمانی کوردیدا دوو بزوێن پێکەوە ناگونجێن. بۆ (نان خۆر)یش هەمان سەرنجمان هەیە، کە بریتییە لە رەگی چاوگ و نیشانەی (ەر)ی بکەری (خو+ەر) و تێچوونی (ە)، لەبەر هەمان هۆ کە لە نموونەکەی پێشوودا روونمان کردەوە.

مامۆستا لە کۆتایی لاپەڕە (20)دا ئەوەی نیشانداوە، کە بەلادانی (ن)ی چاوگ و پیتەکەی پێشی دەتوانرێ (اسم فاعل) لە چاوگی تێپەڕەوە وەربگرین، وەك (خۆر، چێژ، کوژ، ....الخ) لە ((خواردن، چێشتن، کوشتن، رێشتن)).

بەلای ئێمەوە ئەمە هەڵەیە، چونکە ئەگەر چی ڕەگی چاوگ لەبەر ئەوەی پارێزەر و هەڵگری واتای چاوگە و لە وشەسازی (مۆرفۆلۆژی Morphology)دا هەڵسوکەوتی وشەی لەگەڵدا ئەکرێت[5]، بەگشتی واتای چاوگەکانیان نابەخشن. رەگی واش هەیە واتاکەی دەبەخشێت بەلاّم گشتی نییە. بەڵگەشمان نموونەکانێتی کە هێناویەتیەوە. (چێژ)ی لێ دەرچێ، ئایە (خۆر، کوژ) بە تەنیا واتای چاوگەکانیان دەبەخشن؟ بێگومان نەخێر، بەلاّم هەر کاتێك پێشگر یا پاشگر کە بۆ ئەم رێژەی (صیغە) ناوی بکەرە دەشێ ماناکەی خۆیان جارێکی تر دەهێننەکایەوە. نموونەکانی

(5) بڕوانە رای د. نەسرین فەخری و مەسعوود محەمەد لەلاپەڕە (83-84)ی کتێبی (رێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زانستەکانی کۆڕ بەغدا، 1976.

دێڕی یەکەمی لاپەڕە (21)ی کتێبەکەی خۆی کە ((بخۆر، بچێژ، بکوژ، بڕێژ))ن بەڵگەی ئەو رایەمانن.

دانەر لەڕووی بەکارهێنانی (ناوی بکەر)ییەوە، کە دەوری ئاوەڵناوی دەبینێ، لای لەم لایەنەی نەکردۆتەوە، کەچی لە لاپەڕە (26)دا لەژێر سەرباسی ((صفت قیاسی))دا لەناو نموونە ئاوەڵناوە ئاساییەکانیدا، کە بۆ ئاوەڵناوی نسادەی هێناوەتەوە (ناوی بکەر) تیایاندا بەدی دەکرێت، وەك ((... دار فرۆش، کافرۆش...))، ئەوەی راگەیاندووە کە ئەم وشە ناسادانە واتای سیفەتیان پەیدا کردووە.

سەرنجی ئێمە لەم بارەیەوە ئەوەیە پێویست و لەجێی خۆیدا دەبوو کە لەگەڵ بابەتەکەی خۆی (ناوی بکەری)دا ئەمەی لە بەرچاو بگرتایە، چونکە ئەم جۆرە وشە وەرگێراوانە ناشێ سەربەخۆ هەڵسوکەوتی ئاوەڵناوی ئاساییان لەگەڵدا بکرێت، بەڵکو لە بەکارهێناندا کاتێك دەوری تەواوکەری ناوێك یاراناوێك دەبینن و تایبەتێتی و سیفەتیان روون دەکەنەوە ئەوسا دەبنە (ئاوەڵناوی بکەر[6])، ئەگینا ناون بۆ پیشە و خاسیەت و کاری هەڵگرەکانیان لەبەرئەوەی لە چاوگەوە وەرگێراون لایەنی بکەرێتی (فاعیلیەت)یان زۆر بەهێزە. دیسان لە لاپەڕە (58)دا بەناوی ((ادوات فاعل))ەوە کە (ناوی بکەر) پێکدەهێنن، پاشگر و ناو و ڕەگی چاوگی لەگەڵ (ادوات)دا تێکەڵ کردووە لەگەڵ ئەوەدا کە تەنها (یار، وار، وا) پاشگر و نیشانەی بکەرن.

لە بارەی (ناوی بەرکاری)یشەوە دەڵێ: ((اسم مفعول- اسمێکە دلالت بکا لە زاتێ، یا لە شتێ کە کردەوەیێکی واقع ببێتە سەر ئەو زاتە))[7]. بەهەمان شێوەی پێناسەی (ناوی بکەر)، ئەم پێناسەیەش بێجگە لە ناتەواوێکەی بۆ بەرکاری ئاسایی دەلوێت. دوای ئەمە هێماکردنی بۆ ئەوەی کە (ناوی بەرکار)ی لە چاوگی تێپەڕەوە

---

(6) بۆ زێدە ڕوونکردنەوەی ئەو باسە، بڕوانە: نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی کامەران- سلێمانی 1960م، ل129.

(7) سەعید صدقی، سەرچاوەی پێشوو، ل 22.

وەردەگیرێت چونکە (مفعولی) هەیە نرخی باسەکەی بەرزتر کردۆتەوە. لە پاشاندا لەڕووی دروست بوونی ئەم جۆرە وشانەوە دەڵێ: ((بناکردنی اسم مفعول لە غیر مصدری (واوی) بەفرێدانی (ن)ی مصدری لەگەڵ حرفەکەی پێشی و دانانی (راو) لە جێی ئەوان پێکدێ)). ئەمە کە دوو سەرنجی ڕەچاو کردووە پێویستی بە روونکردنەوە و راستکردنەوەیە. یەکەمیان لە چاوگە (واو)یکانیشەوە (ناوی بەرکار) رۆبنرێن، لە چاوگی (گروون) بەلادانی (ن)ەکەی (را)ی چاوگی نادیاری و پاشان پاشگری (و) پێوە دەلکێنین، وەك (گروون – گروو+را+و= گرووراو)[8]. پاشان وەکو لەم نموونەیەی سەرەوە نیشانمدا (راو) نیشانەی (ناوی بەرکار)ی نییە، بەڵکو لە (را) چاوگی نادیاری و پاشگری (و) پێکهاتووە. نابێت و راستیش نییە دوو نیشانە یا دوو شتی جیاواز بەیەك شێوە بێ جیاکردنەوە نیشانبدرێت. کە هەریەکەی ئەرکێکی رێزمانی دەبینێت[9]. مامۆستا وای بۆچووە کە چاوگی (واوی)ی (دروون) ناوە بەرکارێکەی (دروراو)ە و پاشان بۆ سووك کردنەوە دەبێتە (دراو)[10] راستە (دروراو) ناوی بەرکارییە، بەڵام (دراو) زۆر هەڵەیە، چونکە لەڕووی واتاوە لە (دروون) دوور کەوتۆتەوە، ئەمە بێ لەوەی کە رێژەی (دوراو) هەیە و لە (دوورین)ەوە وەردەگیرێ و[11] لە ناوچەی گەرمیان بەکاردەهێنرێ.

باسەکانی تری مامۆستا دەربارەی ناوی جێگا (اسم مکان) کە لە لاپەڕە (24)داو لە لاپەڕە (55-56)دا کە بەناونیشانی ((ادوات مکان))ە بە پێناسەیەك (ناوی جێگا)ی روونکردۆتەوە، بەڵام نموونەکانی لاپەڕە (24)ی هەموو ئاوەڵفرمانی

---

(8) چاوگی (دوورین) هەیە کە دەستووریترە لە (دروون). بۆ رۆنانی وشەی وەك (دووراو)، کە لە شێوە زارەکانی گەرمیاندا بەکارە، باشترە ئەم بەکار بهێنرێت، نەك (دروون)، کە ناوێزەیە.

(9) زمانەوانانی تریش بەدەگمەن نەبێت بە هەمان شێوە – واتە نیشانەی (را)ی نادیاری یان بە نیشانەی ناوی بەرکاری زانیووە.

(10) بڕوانە لاپەڕە (24)ی هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(11) ئەم باسە لە پەراوێزی (8)ی لاپەڕە (8)دا روون کراوەتەوە.

شوێنن و ناوی جێگا نین و نموونەکانی تری لاپەڕە (56)یـش هـەموویانی لـە نـاوەوە وەرگرتووە، لەبەر دووری لە باسەکەی ئێمەوە لێیان نادوێین.

دوا بەدوای کتێبی (صرف و نحوی کوردی)ی سەعید صدقی، کتێبـی (دەسـتووری زمانی کوردی)ی تۆفیق وەهبی بڵاوبۆوە.[12] بەگشتی سەرچاوەیەکی چاك و بەکەڵکە و یەکەم کتێبی کوردییە، کـە بەشـەکانی ئاخـاوتنی کـردووە بـە هەشـت بەشـەوە و لەبارەیانەوە دواوە.

هەڵسەنگاندنی ئێمە لەبارەیەوە، ئەو بابەتە ناوانە دەگرێتـەوە، کـە لـە چـاوگەوە وەردەگیرێـن کـە لەسـەرەتاوە دەسنیـشانمان کـردووە. مامۆسـتا وەهبـی بـەناوی ((دوولایی))ییەوە لە هەندێکیان دواوە، کە راستێکەی (ناوی بکـەر و نـاوی بـەرکار) دەگرێتەوە.

لێدوانەکەشی لـەژێر ئـەم ناونیـشانانەدان: لـە لاپـەڕە (26)دا ((تـەواو کردنـی دوولایی)) و لەلاپەڕە (29)دا ((سینفەکانی گـرێ- گرێـی دوولایـی)) و لـە لاپـەڕە (67)دا ((سفەتی چۆنی لە فیعل دروست کراو)) و لەلاپەڕە (70)دا دروسـت بـوونی سفەتی چۆنی لێکدراو)).

شایانی باسە لـە لاپـەڕە (26)دا ئـەوەی راگەیانـدووە کـە ئـەم (دوولایـی)یانـە رێژەیەکی فرمانن و دەبنە ئاوەڵناویش و کەسدارنین. بەڵام لە هـەموو ئـەو بابەتانـەی سەرەوەیدا کە بە (دوولایی) و هەرجارەی لـەژێر سەرباسـێکدا ناویـان دەبـات و پێـی لەسەر دەوری (ئاوەڵناوی) یان دادەگرێت، بەوەی کە دەبنە تەواوکـەری نـاو و ڕانـاو، وەکو نموونەکانی (منـاڵی نووستوو، تۆی نووسـتوو، داری زۆر سـووتاو) (ل26)، (زگ سووتاو، گیا خۆر) (ل29)، (مردوو، کوژراو) (ل67)، ((نـان خـۆر، بـابردوو، بـاوك مردوو، سەرپێچراو)) (ل70). لێرەدا چەند کەموکوڕییەك دەسنیشان دەکەین، وەکو:

1- ناوبردنی ئەو نموونە و بابەتانەی سەرەوە بـە ((دوولایـی)) هەڵەیـە، لەبەرئـەوەی راستی نموونەکان دووبابەتی سەربەخۆی جیاواز لە یەکتری وەکو (ناوی بکەر) و (نـاوی

---

(12) تەوفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، جزمی یەکەم، بەغدا، 1929.

بەرکار) نیشان ئەدەن و نابێت هەرجارەی بەسەر باسێکی جیاواز لێیانەوە بکۆڵرێتەوە، وەکو لێکۆڵینەوەکەی مامۆستا وەهبی، چونکە دوو بابەتی سەرەکی و سەربەخۆن.

2- راستە کە بوونە تەواوکەری ناو و راناو و دەبنە ئاوەڵناو، بەڵام نووسەر بێجگە لەو دۆخانەش هەر بە ئاوەڵناویانی زانیوە، کە لە کاتێکدا ئەم (ناوی بکەر) و (ناوی بەرکار)ە ناون و ئەرك و تایبەتییەکانی نا و وەردەگرن لەڕووی بەکارهێنان و وەرگرتنی نیشانەی (تاك و کۆ) و (ناسراو و نەناسراو)ەوە[13]، لەبەر ئەمە ناوبردنیان بە ((ئاوەڵناو، گرێی دوولایی، سفەتی چۆنی)) واتە هەر جارەی لەژێر باسێکدا نادروستە، چونکە خۆیان بریتین لە باسێکی سەربەخۆ و تایبەتی، کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن و دەوری ناویش و ئاوەڵناویش وەردەگرن. کەچی نووسەر تەنها باسی ئاوەڵناوێتییانی کردووە.

3- وشەکانی (نووستوو)، باوك مردوو، گیاخۆر، نانخۆر) ناوی بکەری داڕژاو و لێکدراون و لە قەدی تێنەپەڕی گوێزانەوە و تێپەڕەوە وەرگیراون، یا ناوەکەی پێشیانەوە دەوری بەرکاری وەرگرتووە و بۆتە (ناوی بکەر وەکو (باوك مردوو). بەڵام نموونەکانی وەکو (کوژراو، سووتاو، بابردوو، سەرپێچراو) ناوی بەرکاری داڕژاو و لێکدراون.

4- بەگشتی باسەکەی تێکەڵ و پێکەڵە و دووبارە کردنەوە و لە یەك چوونی تێدایە و پێویستی بەو دووپات کردنەوەیە نەدەکرد.

مامۆستا وەهبی لەژێر ناونیشانی ((ناوی دروستکراو لە فعل)) لە (ل25)دا ئەوەی رەچاو کردووە کە لە چاوگەوە دەتوانرێ هەندێ ناوی تایبەتی وەربگیرێت. ئەمە راستە، بەڵام تاکە نموونەیەکیشی بۆ نەهێناوەتەوە لە کاتێکدا خۆی هێمای ئەوەی کردووە کە دەتوانرێ دەستوورێکی بۆ دابنرێت.

لەم بابەتەیدا، واتە- دروستکردنی ناو لە فرمان- لە بەندی (159، 160)ی لاپەڕە (52)دا دوو دەستووری داناوە بۆ ئەو ناوانەی لە چاوگی تێنەپەڕی بە (اندن)

---

(13) بڕوانە نووری عەلی ئەمین سەرچاوەی پێشوو، ل130.

کراو و چاوگە تێنەپەڕە (یائی)یەکانەوە کە بەلادانی نیشانەی چاوگەکانیان (ناو) دروستدەبێت و بێ ئەوەی جۆری نموونەی ناوە وەرگیراوەکانی وەك ((تەقە، کۆکە، بارە، زریکە)) کە (ناوی چاوگ)ن دەسنیشان بکات. هەروەها لە بەندی (161)ی لاپەڕە (53)دا کۆمەڵێك نموونەی هێناوەتەوە، کە بەلایەوە بێ دەستوور دروستبوون و جۆری ناوەکانیشی بەهەمان شێوەی سەرەوە روون نەکردۆتەوە، کە چەند جۆرێك ناویان تێدایە و تێکەڵی کردوون، بێ ئەوەی جۆرەکانیانی دیاریکردبێت. نموونەی ناوی وای تێدایە، کە سەربەخۆیە و لە چاوگەوە وەرنەگیراوە. ئەمە بێجگە لەوەی زۆربەیان دەستوورین و دەچنە ژێر ناوە دەستوورییەکانی وەك (ناوی چاوگ، ناوی ئامێر ناوی تایبەتی، ناوی پیشەو کار).

نووسەر لەژێر سەرباسی ((سفەتی چۆنی لە فعل دروستکراو))ی (ل67)دا دەڵێ: ((بەخستنی ئەداتی (ۆك) لەدوای ڕەگی هەندێ فیعلی لازیمەوە سفەتی چۆنی دروست بووە، وەکو: گەڕان- گەڕۆك، فڕین- فڕۆك، بەزین- بەزۆك)). راستە ئەمانە دەبنە ئاوەڵناو، بەڵام ((گەڕۆك، فڕۆك)) و ئەوانەی لەم ڕێژەیەن و بەزۆری لە چاوگی (گوێزانەوە- انتقالی)ن (ناوی بکەری دارِژاو)ن و دەبنە ئاوەڵناویش، وەکو (ئاوەڵناوی بکەری دارِژاو) لە بەکارهێناندا. ئەوانەی لە چاوگی ((روودان- مگاوعە)ن لەبەر بەردەوامیی سیفەتەکەیان پێیانەوە دەبنە (ئاوەڵناوی بەرکاری دارِژاو).

مامۆستا نوری عەلی ئەمین و خۆ خەریك کردنی بە زمانی کوردیێوە سوودێکی زۆریان گەیاندووە بە زمانەکە و دەرکردنی کتێبی ((ڕێزمانی کوردی)) نموونەی نایابی ئەو هەوڵەیەتی[14]. لەم کتێبەدا لەو وشانەوە دواوە، کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن. لە لاپەڕە (66)دا لەژێر ناونیشانی جۆرەکانی (ناو)دا بە سێ خاڵ باسی پێکهاتنی (ناوی

(14) نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، سلێمانی، 1960. ئەم کتێبە دوو بەرگی تری هەیە، وەك، قەواعیدی زمانی کوردی، بەرگی یەکەم، بەغدا، 1956، ل (51-55)، بەرگی دووەم بەغدا، 1958، ل (67-70)، لە ناوی بکەر و ناوی بەرکاری کۆڵیوەتەوە، ئێمە بەرگی سێیەمی بۆ باسەکەمان وەردەگرین.

مەعنەوی)ی کردووە. خالّی (ج)ی (ناوی چاوگ) دەگرێتەوە کە لە ڕەگی چاوگ و پاشگری (ە)وە داڕێژراوە. باسی شێوەی تری ڕۆنانی ئەم ناوەی نەکردووە، کە چەند شێوەی دی هەیە لە ڕەگی چاوگ، یا لە ڕەگی چاوگ و پاشگرەوە پێکدەهێنرێن.

لە ل(126)دا (ناوی بکەر و ناوی بەرکار)ی لە ریزی جۆرێك لە جۆرەکانی ئاوەڵناو داناوە، کە بە ((ئاوەڵناوی فرمانی)) ناوی بردووە. گومانی نییە، ئەم بابەتانەی سەرەوەی بە هەڵە لە ریزی ((ئاوەڵناوی فرمانی))[15] داناوە. تەنانەت نابێ لە ریزی جۆرەکانی ناویشدا دابنرێت، چونکە بابەتێکن لە فرمانەوە وەردەگیرێن و دەبێت لە بەشی (چاوگ)دا یا سەربەخۆ لێی بکۆڵرێتەوە، بەڵگەشمان رای نووسەر خۆیەتی کە لە هەمان لاپەڕەدا دەڵێ: ((ئاوەڵناوی فرمانی ئێسکێکی فرمانە و تام و بۆی ناو ئەدا...)). ئەگەر چی ئێمە وەك لەسەرەوە روونمانکردەوە، بە (ئاوەڵناوی فرمانی) نازانین، بەڵام مەبەستی ئێمە ئەوەیە لێرەدا بابەتی باسەکەمان دەگرێتەوە. لە هەمان شوێندا (جگەرەکێش)، کە (ناوی بکەری لێکدراو)ە بە فرمانی ناو بردووە، چونکە بەلایەوە ((جگەرەکێش... فرمانە چونکە بەیانی کارێ ئەکا)). ئەم وشانە کەس و کاتیان تیانییە، ئەگەرچی لە فرمانیشەوە وەرگیراون.

پاش ئەمە نووسەر ئەوەی راگەیاندووە ((ئاوەڵناوی بکەر کە لە چاوگ (المصدر) وەرگیرێ ئەمیش دوو جۆرە: ئاوەڵناوی بکەری سادە، ئاوەڵناوی بکەری لێکدراو))

---

(15) نووسەر لە بەشی (ناوی لێکدراو)ی ل(62-63)دا و لە بەشی (ئاوەڵناوی لێکدراو)ی ل(112-114)ی ئەم کتێبەدا جارێکی تر لەنێو زۆربەی نموونەکانی هەردوو بابەتەکەدا (ناوی بکەر و ناوی بەرکار) دەبینرێن، کە جارێك بەناو و جارێکی تر بە ئاوەڵناو بە هەڵە هەمان ریزەیان دووبارە کردۆتەوە بە هەڵە. راستە ئەم بابەتانە دەبنە ناویش و ئاوەڵناویش، بەڵام نابێت هەر جارەی بەجۆرە بابەتێك باسیان لێوە بکرێت. چونکە دەبێت لەژێر بابەتی (ناوی بکەر، ناوی بەرکار)دا لێیانەوە بکۆڵرێتەوە و هێمای ئەوە بکرێت، کە بێجگە لە دەوری ناویی ئەم بابەتانە لەڕووی بەکارهێنانەوە دەوری ئاوەڵناویش دەبینن. ئیتر پێویست ناکا بەدوو بابەتی جیاواز بەرچاو بگیرێن، چونکە لە چاوگەوە وەردەگیرێن. بەڵام نابێت هەر جارەی بە بابەتێك باسیان بکرێت.

(بڕوانە ل127). راستە نـاوی (بکـەر) لـە چـاوگەوە وەردەگیرێـت، بـەڵام پێناسـەی بابەتەکەی نیوەچڵە، چونکە سیفەتێکی هەمیشەیی و توانای تایبەتییانیش تیایە. ئەم بابەتە شێوەی (سادە)ی نییە، بەڵکو دارێژاو و لێکدراوی هەیە و ئەوەی ئەو بە سادەی داناوە (ناوی بکەری دارێژاو)ن، (بڕوانە: ل127، 129). لـە پاشـاندا راسـتە (نـاوی بکەری دارێژاو)ی لە قەد و ڕەگی تێنەپەڕ و تێپەڕەوە بەهۆی پاشـگر و پێـشگری ((و، ەر، ب))ەوە وەرگرتووە. شێوەی پێکهاتنی (ناوی بکەری لێکدراو)یشی لـە تێپـەڕەوە باسکردووە.

لەمەی سەرەوەدا لەگەڵ بەرچاوگرتنی لایەنـە راستەکانیـشیدا، ئـەم ناتەواوییانـە دەبینرێن:

1- ناوی بکەری دارێژاوی بەهەڵە لە قەدی تێنەپەڕی روودان (مطاوعە)ەوە وەرگرتووە وەك ((سـووتاو، مـردوو)) کـە ئەمانـە (نـاوی بـەرکاری) دارێژاون، چـونکە لـە خۆیانەوە روو نادەن تا هێزێك یا بەهۆی بکەرەوە نەبێت، لە کاتێکدا بکەریشیان دیار نییە. ئەوانەی لە قەدی تێنەپەڕی گوێزانەوە (انتقالی)ن دەبنە نـاوی بکـەر وەکو (هاتوو، کەوتوو، رۆیشتوو، گریاو).

2- لەڕووی دەنگسازێوە جیاوازی نەکردووە کە ئەو وشانەی سەرەوە کە بەلای ئەوەوە (ناوی بکەر)ن، ئەگەر بە بزوێنی (ا،ی) کۆتاییان هاتبوو ئەوا تەنها بە پاشـگری (و-W) دەبنە ناوی بکەر و ناوی بەرکار. بەڵام ئەگەر بە (دالی، تائی) کۆتاییـان هاتبوو بە (واوی) درێژ (وو-ū) دروست دەبن.

3- جۆری ئەو چاوگانەی کە بەهۆی پێشگری (بـ) و رەگەکانیانەوە دەبنە ناوی بکەر روون نەکردۆتەوە کە تێپەڕن.

لەلاپەڕە (128،129)دا لە وەرگرتنی ڕەگی چاوگەکانی (پێ لێ خستن، لەناو بردن))[16] بۆ پێکهاتنی (ناوی بکەری لێکدراو)ی ((پێ لێ خەر،... لە ناوبەر)) بە هەڵە بە ((پێ لێ خ،... لەناو ب)) زانیوە. ڕاستێکەی ڕەگەکانیان ((پێ لێ خە، لە ناوبە))یە. وادیارە، مامۆستا دەنگی (ە)ی ڕەگەکانیانی بە (ە)ی (ەر)ی نیشانەی (ناوی بکەر) زانیوە[17]. ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە و پێویستی بە ڕاستکردنەوە هەیە، کە بەم شێوەیەی خوارەوە ناوە بکەرێکان دروستبوون:

پێ لێ خستن: پێ لێ خە + ەر= پێ لێ خەر (بزوێنێکیان نامێنی کە (ە)یە.

لە ناوبردن: لە نا بە + ەر= لەناوبەر (هەمان هۆ).

وێڕای ئەوە، لەم ڕاستکردنەوەیەدا، دەبێ ئەوەش بزانین هەندێ پاشگری (ناوی بکەری دارڕژاو)ی وەك (ەر، ە)، لە دروستکردنی (ناوی بکەری لێکدراو)دا دەور دەبینن.

مامۆستا نوری عەلی لە لاپەڕە (129)دا ڕادەی باسەکەی بەرز کردۆتەوە بەوەی کە ڕایگەیاندووە ناوی بکەر بە هەردوو شێوەکەیەوە لە بەکارهێناندا دەبنە ناویش و ئاوەڵناویش. بە شێوەی ناو ئەرك و تایبەتێتی (خاسیەت) وەردەگرێ، بەڵام نووسەر ئەرك و خاسیەتیش هەر بە ((وەزیفە — ئەرك)) ناوبردووە. لەڕاستیدا نموونە و روونکردنەوەکانی لەو ڕووەوە چ وەکو ناو چ وەکو ئاوەڵناو ڕاستن، بەڵام نابێت هەردوو (ئەرك و تایبەتێتی) ناو بە ئەرك ناوببرێن چونکە دوو بابەتی ڕێزمانی لە یەکتر جیاوازن[18].

---

(16) نوری عەلی لەجیاتی (نیشانەی چاوگ) پیتە پاشگری بەکارهێناوە. ئەمە جێی سەرنجە، چونکە نیشانە و پاشگر دوو شتی لە یەکتر جیاوازن، نیشانە تایبەتە بە خاسیەتێکی ڕێزمانیەوە، بەڵام پاشگر لە شوێنی جیاواز جیاوازدا بەکاردەهێنرێت و دەوری ڕۆنان دەبینێ.

(17) لە ل(84 ،113)دا بە هەڵە (کەر)ی بە پاشگر داناوە، لەڕاستیدا بریتییە لە (کە)ی ڕەگی (کردن) و پاشگری (ەر)ی نیشانەی ناوی بکەری. هەروەها (خۆر)یش هەمان شتە.

(18) لە شوێنێکی تری ئەم باسە و لە شوێنی خۆیدا بە تەواوی روونیان دەکەینەوە.

بێجگە لەوانەی کە لە چاوگی تێنەپەڕی روودانن زیاتر بەلای ئاوەڵناویدا دەچن.

نووسەر لە لاپەڕە (129) هاتۆتە سەر (ناوی بەرکار) و بە پێناسەیەکی ناتەواو کە بۆ بەرکاری ئاسایی دەشێت دەستی بە باسی (ناوی بەرکار) کردووە. بەهەمان شێوەی (ناوی بکەر) لەم بابەتەش دواوە چ لەڕووی شێوەی پێکهاتنەوە چ لەڕووی بەکارهێنانەوە. لەبەرئەوەی ناتەواوییەکانی هەمان ناتەواو بن، بۆیە لەو دوو رووەوە، سەرنجی راستکردنەوەمان هەمان چەشنە کە لە بەشی (ناوی بکەر)دا لە سەرەوە دەرمان بڕی... سەرەڕای ئەوە، چەند تێبینییێکی دیمان سەبارەت بە هەندێ بۆچوونی نووسەر هەیە، لێرەدا بەکورتی لێیان دەدوێین. ئەویش ئەوەیە لە لاپەڕە (129)دا ناوی بەرکاری (جەرگ بڕاو)ی بەدوو (ر) نووسیوە. لە راستیدا ئەمە ناشێت، چونکە تەنانەت ئەگەر ڕەگی چاوگەکەش بە (ر) کۆتایی هاتبێت، وەك (بڕین کڕین...) لەبەر قورسی دەربڕین پێویستە و واش ڕۆیشتووە بە یەك (ر) بنووسرێت، تاکو لەگەڵ (ر)ی (را)ی فرمانی نادیاریدا تێکەڵبکرێت و بەیەك (ر) بنووسرێت. بەم شێوەیە:

ڕەگ + نیشانەی نادیاری + پاشگری بەرکاری

(بڕین: بڕ + را + و= بڕاو) هەروەها (کراو) و هی تریش.

دوای ئەمە نووسەر لە لاپەڕە (129، 130، 131)دا[19]، (را)ی فرمانی نادیاری و پاشگری (و)ی بەرکاری بە (راو) داناوە و تێکەڵی کردوون. ئەمە بۆچوونێکی ناڕاستە، چونکە خۆی لەخۆیدا نیشانە و پاشگرێکە سەر بە دوو بابەتن. وەکو چۆن لەسەرەوە روونمان کردەوە، لە ڕۆناندا دەبێ جیابکرێنەوە.

---

(19) لە ل(152، 153، 154) لەژێر ناونیشانی (پیتە پاشگری ڕەگی فرمان)دا ژمارەیەك نموونەی هێناوەتەوە، کە لەڕەگی فرمان و پاشگر پێکهاتوون. لە هەندێکیاندا جۆری ناوەکانی دەرنەخستووە کە (ناوی بکەر، ناوی ئامێر، ناوی چاوگ) دەگرنەوە. لە خاڵەکانی (4، 5، 8، 9، 11)دا دیسان پاشگری (ناوی بەرکاری)ی بە (راو) زانیوە و لەسەرەوە ئەمەمان راستکردۆتەوە. شایانی باسە لە خاڵەکانی تری (7، 12، 15، 18)دا جۆری ناوەکانی بەراستیی دیاریکردووە، بەڵام دەبوایە ئەم بابەتانەی بەجیا باس نەکردایە و لەگەڵ (ناوی بکەر و بەرکار)دا لێیان بدوایە.

دوای نوری عەلی ئەمین کتێبی ((اوائو دەستورا زمانی کوردی))ی جگەر خوێن بلاوکرایەوە[20]. نووسەر لە دابەشکردنی بەشەکانی ئاخاوتندا بەسەر (ناو، فرمان، پیت)دا وەکو سەعید صدقی پێڕەوی زمانەوانانی عەرەبی کردووە. لەم کتێبەدا وەکو پێشوو رووداوەکەینەوە جیّ مەبەستی خۆمان. مامۆستا جگەر خوێن پێش خۆی کەسێکی تر نابینرێت وەکو بابەتی سەربەخۆ لە رێزمانی کوردیدا لە (ناوی جێگا، ناوی ئامێر، ناوی بکەر، ناوی بەرکار، ناوی واتایی) دوابێت. بەمە نرخی کتێبەکەی بەرز کردۆتەوە بەلام هەندیّ تێکەڵی و ناڕێکی باسکردنەکەی بوونەتە هۆی شێواندنی.

لە لاپەڕە (21)دا لەژێر سەر باسی (ناوی جێگا)دا بە پێناسەیەك دەستی بە باسەکەی کردووە و نموونەیەکی زۆری بۆ هێناوەتەوە، بەلام تێکەڵی نموونەکانی لە ناوی جێگا، پاشگری شوێنی، ئاوەڵفرمان... لە راستی پێناسەکەی کەمکردۆتەوە.

دوا بەدوای ئەمە لەڕووی پێکهاتنەوە ئەگەر چی بە باشی ناوی جێگای بەسەر (سەربەخۆ، پێکهاتوو)دا دابەش کردووە بەلام نموونەکانی بەدەگمەن وشەی وای تێدایە، لە چاوگەوە وەرگیرابیّ. لە بەشی دووەمیشدا وا بۆی چووە کە بەناو و پاشگر دروستدەبن و ناوی فرمانی هەر نەهێناوە، کە ناوی جێگای لێوە وەردەگیرێت... لە لاپەڕە (123)دا لەژێر سەرباسی (ئامرازی جێگا)دا[21] هەمان پاشگرەکانی سەرەوەی بۆ دروستکردنی ناوی جێگا بە نموونە هێناوەتەوە، لە راستیدا دەبوایە ئەم باسەی بە تەنها نەهێنایەتەکایەوە، چونکە دووبارە کردنەوەی باسەکەی یەکەمە و بەکەموکوڕی دادەنرێت لە لێکۆڵینەوەدا.

نووسەر بە هەمان شێوەی (ناوی جێگا) لە (ناوی ئامێر)یش دواوە.

لێرەشدا بە پێناسەیەك و نموونە و هەمان دابەشکردنەوە باسەکەی دامەزراندووە (بڕوانە: ل23-24). لە بەشی (ناوی ئامێری پێکهاتوو)دا زۆربەی نموونەکانی لە چاوگەوە وەرگیراوە، کەچی بەهیچ جۆرێك شێوەی داڕشتن و رۆنانیانی باسنەکردووە.

---

(20) جگەر خوێن، اوا ئو دەستورا زمانی کوردی، بەغدا، 1961.

(21) ئامراز: راست نییە لە جیاتی پاشگر و پێشگر بەکار بهێنرێت.

ئەمە بۆتە هۆی کەموکورِی لێکۆڵینەوەکەی، چونکە ناوی (چاوگ یاناو)ی نەبردووە، کە لەوانەوە ناوی ئامێر وەردەگیرێت.

لە لاپەڕە (41)دا باسی (ناوی بکەر) بەرچاو دەکەوێت، بەڵام پێناسەکەی بکەری ئاسایی دەگرێتەوە، نەك (ناوی بکەر)ی لە چاوگ وەرگیراو. لەرِووی پێکهاتنەوە دوو شێوە دابەش کردنی بابەتەکە بەسەر (سادە و لێکدراو)دا دەبینرێت و نموونەکانی بەشە سادەکەی تێکەڵن لە (ئاوەڵناو، ناوی چاوگ، ناوی بکەر)[22]. شتێکی گومان نەویستە، نەك هەر (ناوی بکەر)، بەڵکو هەموو ئەو بابەتانەش، کە لە سەرەوە خستمانەڕوو، رێژەیەکی (ناوی چاوگ)ی لێ دەربچێت کە لە ڕووی پێکهاتنەوە (سادەیە)، دەنا هەموویان دارِژاو و لێکدراون و (سادە)یان نییە، چونکە لە فرمانەوە بە یارمەتی پێشگر و پاشگر وەردەگیرێن.

نووسەر بەهەمان شێوەی نوری عەلی ئەمین بە ناڕاستی لە قەدی تێنەپەڕی چاوگی روودان و پاشگری (و، وو) وە کە (ناوی بەرکار)ی لێ پێکدێت، (ناوی بکەر)ی وەرگرتووە وەك (مردوو، رزیو) لەگەڵ ئەو رێژەیەی (ناوی بکەر) کە لە قەدی تێنەپەڕی چاوگی گوێزانەوەوە وەردەگیرێن وەك (کەوتوو) تێکەڵ کردووە. هەروەکو لە سەرەوەی ئەم باسەدا رونمانکردەوە لە قەدی چاوگی تێنەپەڕی روودانەوە (ناوی بەرکار)ی پێکدەهێنرێت. چونکە ئەو قەدانە بکەرەکانیان دیار نییە، کە لەلایەن کێوە رووی داوە و کارەکەی بەسەریاندا هێناوە. بۆیە دەبنە (ناوی بەرکار). بەڵام لە رێژەی گوێزانەوەکەیەوە (انتقالی) چونکە بکەرەکانیان کە خاوەنی رووداني ئیشەکەیانن دیارە، (ناوی بکەر) وەردەگیرێت وەکو (هاتی، کەوتوو)ی نموونەکانی خۆی لە (ل45، 46) دان و تێکەڵی رێژەکەی دییانی کردبوو وەك (مردوو، رزیو) لە هەمان لاپەڕە کە راستێکەیان (ناوی بەرکار)ن.

---

(22) بڕوانە ل (42)ی سەرچاوەی پێشوو.

نووسەر لەدابەشکردنەکەی دووەمیدا لەڕووی پێکهاتنەوە (ناوی بکەر)ی لە تێنەپەڕەوە وەرگرتووە وەك (مای، هاتی)[23] راستێکەی رابردووی نزیکن. لە (ل 45)دا (فرۆشەر، چێنەر، بکێش، بچێن) لە (ل 46)دا بە (ناوی بکەری سادە) یان دەزانێت و جۆری چاوگەکەی کە تێپەڕە ناوی نەبردووە و پاشگری (ەر)ی ناوی بکەر بە تەنها بە (ئەر) نووسیووە، کە ئەمە هەڵەیە، چونکە دەنگی هەمزە ( ء) لە کوردیدا ئەگەر چی هەیە و بەزۆری لە پێش بزوێنەوە دێت لەوێدا نییە و تەنها شێوەی کۆکردنەکەی بە تەنها وایە و راست نییە بە نووسین بنووسرێت.

نووسەر هەمان هەڵەی لەناوبردنی پاشگرەکانی وەك (ئە، اوك، ئەك) لە لاپەڕە (48)دا دووبارە کردۆتەوە، کە راستێکەیان (ە، وك، ەك)ە، وەك لە نموونەکانی (بالە، خوەرە، کە نوك، دزەك)ی خۆیدا دەردەکەون.

نووسەر لە بەشی (ناوی بکەری لێکدراو)دا لە (ل 47)دا ژمارەیەك نموونەی لەژێر ناوی (ئامراز)دا هێناوەتەوە، کە بەهۆیانەوە (ناوی بکەری لێکدراو)ی دروستکردووە، کەچی تێکەڵن لە (ناو، پێشگر، پاشگر، ڕەگی چاوگ و (ەر)ی ناوی بکەری). نموونە دروست کراوەکانیشی تێکەڵن لە داڕژاو و لێکدراو لە ناویش و لە چاوگەوە وەرگیراون. لە ڕاستیدا دەبوایە نموونەکانی تەنها لە چاوگەوە وەربگرتایە، چونکە بابەتەکە پەیوەندی بە چاوگەوە هەیە، نەك ناو. هەر لەبەر ئەمەشە لایەنی بکەرێتی (فاعیلیەت)یان تێدا بەهێزە[24].

لە هەمان لاپەڕەدا نموونەی (ناوی بکەری لێکدراو)ی لە چاوگە بەتێپەر کراوەکانەوە هێناوەتەوە و دەڵێ: ((لە چاوگی یائێوە کە بەهۆی (اند)ەوە دەبنە تێپەڕ (اين) شوێنی (اند) دەگرێ وەك: ((دەڤ چڕین، جل قەتین، اش گەڕین...)). زۆر راستە

(23) (چوی) بەلای منەوە (ناوی بکەر) نییە چونکە لە چاوگی ناوێزەوە وەرگیراوە واتای ناوی بکەر بەشێوەی سادەیی نابەخشێت، تەنها بەداڕژاوی نەبێت، وەکو (هەڵچوو، رۆچوو، هەڵبوو) دەبێتە (ناوی بکەری داڕژاو) چونکە بە سادەیی لەگەڵ فرمانی رابردووی نزیکەکەیدا تێکەڵ دەبێت.

(24) بڕوانە رای م. محمد لە ل(63-64) گۆڤاری زانیاری ژمارە (4) ساڵی 1972.

لەڕەگی چاوگی لێکدراوی بە تێپەڕ کراوەوە ناوی بکەر وەردەگیرێ، بەڵام ئەم چاوگانە کە لە بنەڕەتدا (یائین) و هەروەها چاوگی تری نایائیش، کە بە هۆی (اندن)ەوە دەبنە تێپەڕ دەچنە ریزی چاوگە (دالی) یەکانەوە، راست نییە بەشێوەی پێشووی ناوبەرێت. دیسان باش بۆی نەچووە کە وای داناوە (این) شوێنی (اند)ی گرتۆتەوە، چونکە لەوێدا تەنها (1) لە وەرگرتنی ڕەگی چاوگەکەدا. دەگۆڕێت بە (ی) و وپاشان (ین) راسترە لە (این). دەنگی (ا) لێرەدا زیادە و بەهەڵە هێناویێتییە ناوەوە.

دواشت لەڕووی توخمەوە (جنس) (ناوی بکەر و ناوی بەرکار)ی باس کردووە و دیاریکردووە کە (ئی) بۆ نێر و (ا) بۆ مێ لەگەڵیاندا دێت.

لە (ل 50)دا (ناوی بەرکار) بە پێناسەیەك بەرچاو دەکەوێت، کە تەنیا بەرکاری ئاسایی دەگرێتەوە و دابەش کردنەکەشی بە هەمان شێوەیە و لە (ناوی بەرکار)ێوە دوورە. لەبەر ئەوە درێژە بەم باسە نادەین و وەك وتمان جیاوازییەکی تەواو لەنێوان بەرکاری ئاسایی و (ناوی بەرکاری)دا هەیە، چونکە دووەمیان لە چاوگەوە وەردەگیرێت و ناوی تری جیاواز ناتوانێت هەمان دەوری وەربگرێت، بەڵام لە رستەدا هەموو ناوێکی ئاسایی دەوری بەرکاری ئاسایی وەردەگرێت.

دواشت کە بابەتەکەی ئێمە بگرێتەوە، ئەوەیە کە نووسەر لە (ل:67)دا لە (ناوی واتایی) دواوە و بە پێناسەیەکی راست و چەند نموونەیەکەوە باسیکردووە. لەناو نموونەکانیدا لەڕووی وەرگرتنەوە تەنها دەنگە سروشتییەکانی بەرچاوگ دەکەون و ئەوانی تریش ناوین سەرەڕای ئەوەش کەم و زۆر لە بارەی ڕۆنانیانەوە نەدواوە.

ساڵی 1972 لەلایەن بەڕێوەبەرێتی خوێندنی کوردییەوە لێژنەیەکی ئەو بەڕێوەبەرێتییە، کتێبی ((زمان و ئەدەبی کوردی)) بۆ خوێندنی پۆلی سێیەمی ناوەندی قوتابخانەکان دانا[25].

(25) محەمەد مستەفا کوردی، مستەفا صالح کەریم، ئەبو بەکر جەلال، عەبدوڵڵا میدیا، زمان و ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، بەغدا، 1972.

بەشی ڕێزمانەکەی بریتییە لە (ڕەگی فرمان = ڕەگی چاوگ)، (فرمانی ڕانەبردوو)، (جۆرەکانی فرمانی ڕابردوو)، (ئاوەڵناوی بکەر)، (ئاوەڵناوی کراو = اسم المفعول)، (ناوی گوزارە = الاسم المصدر)، (پێشگر و پاشگر).

لێرەدا تیشکی لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنەکەمان دەخەینە سەر (ئاوەڵناوی بکەر) و (ئاوەڵناوی کراو) و (ناوی گوزارە = الاسم المصدر)کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن.

لە لاپەڕە (20)ی کتێبەکەدا بەگشتی لە ئاوەڵناوی بکەر دواون و چەند نموونەیەکی وایان هێناوەتەوە، کە هەموو شێوەکانی لە ڕستەدا دەرخستووە.

لە پاشاندا ئەوەیان ڕوون کردۆتەوە کە هەر وشەیەکی ئاوەڵناوی بکەر ((ناوی خاوەن فرمانێکە یا بکەری فرمانێکی ئەو تۆیە کە کاتێکی دیاری تیا بەدی ناکرێت...[26])) (ل20). پاش ئەمە هاتوونەتە سەر کەرتکردنی یەکە یەکەی نموونەکان بە دیارکردنی ڕەگی ئەو فرمانانەی کە لێوەی وەرگیراون و ئەو پێشگر و پاشگرانەی کە تایبەتن بە پێکهێنانی ئاوەڵناوی بکەرەوە. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە نەخشەیەکیان بۆ هەموو ئەو پێشگر و پاشگرانەی وەك ((ب، ۆك، نۆك، ندە، وو، ا، ەر، و، ەوار)) خستۆتەڕوو، کە دەبنە هۆی پێکهاتن و داڕشتنی ئاوەڵناوی بکەر لە چاوگەوە. لەمەوەش بە ناونیشانی ((دەستووری داڕشتنی ئاوەڵناوی بکەر لە ڕەگ و چاوگی نون کرتاوی فرمان[27]))... چەند دەستوریێکیان هەڵێنجاوە، کە ((هەندێ ڕێژەی ئاوەڵناوی بکەر لە ڕەگی فرمان و پێشگرەکانی: (ب) و (بە) دروستدەبن، وەك: بژەن، بەگەڕ....)) (بەوانە: ل21) لێرەدا لێژنە دوو هەڵەی زۆر گەورەی دێنە پێش چاو: یەکەمیان ((چاوگی نون کرتاو)) بۆ مەبەستی لادانی (نونی چاوگ) ڕاست نییە، چونکە چاوگی نون کرتاو بە تەواوی (مصدر مرخم) دەگرێتەوە، بەتایبەتی بۆ ئەم مەبەستە لە کوردیدا شتی وانییە.

---

(26) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل 21.

(27) سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

لێژنەش بە هەڵە (ناوی بکەر)ی وەکو نووسەرانی پێشوو لە قەدی تێنەپەڕی چاوگی رووداندەوە وەکو (تەقیو، رزیو) کە (ناوی بەرکار) دروستدەکەن وەرگرتووە (بڕوانە: ل20، 21).

پێشگری ((ب)) بۆ دارِشتنی ناوی بکەری زۆر راستە، بەڵام شێوەکەی تری کە (بە)یە سەرنج نەدانی لێژنە نیشاندەدات، چونکە (بە) ئامرازی پەیوەندییە و مەبەست و شوێنی (ب) نیشانەی پێکهاتنی ئاوەڵناوی بکەری ناگرێتەوە. لەلایەکی ترەوە دەبوو جۆری چاوگەکانی ئەم رێژە ئاوەڵناوە بکەریانە، کە تێپەڕن، دەستنیشان بکردایە.

هەروەها لە لاپەڕە (23)دا پلەی باسەکەیان بە لێدوان بەوەی چۆن ((هەندێ جار ئاوەڵناوی بکەر لە ناوێك و ڕەگی فرمانێك دروستدەبێت)) کە شێوە لێکدراوەکەیەتی لەڕووی پێکهاتنەوە، زۆر بەرزتر کردۆتەوە.

لێژنە دوا بەدوای ئەم رێژە ئاوەڵناوە بکەریانە لە ژێر سەر باسی ((ئاوەڵناوی کراو))دا بە هەمان شێوەی ئاوەڵناوی بکەر لەم بابەتە بە نموونەوە دواوە. نووسەرانی ئەم کتێبەش وەکو نوری عەلی ئەمین باشی بۆچوون کە ئەم (ئاوەڵناوی بەرکاری)یە بەپێی ئەرك و بەکارهێنانیان بە ناویش و ئاوەڵناویش داناوە و بۆ ئەوەش چوون کە لە چاوگی تێپەڕەوە لە هەر پێنج جۆر نیشانەی چاوگەوە- بێجگە لە (چاوگی واوێکانی)- بەهۆی پاشگری ((راو))ەوە پێکدێن، هەروەها لەو چاوگە تێنەپەڕانەوەش کە بە (اندن) کراون بەتێپەڕ. راستی بۆچوون کە ئاوەڵناوی کراو لە تێپەڕەوە دادەڕێژرێن، بەڵام کەموکوڕی لێژنە وەکو رێزمان نووسانی پێش خۆیان[28] کە لە سەرەتاوە سەرنجمان بۆ راکێشاوە، ئەوەیە (راو)یان بە یەك پاشگر داناوە، کە خۆی لە راستیدا بریتییە لە (را)ی چاوگی نادیاری و (واو)ی ئاوەڵناوی بەرکاری.

ئەو هەڵەیەی لە باسی ئەو ئاوەڵناوە بکەریانە کە لە چاوگی نون کرتاوێوە دروستدەبن کردبوویان لێرەشدا دووبارەیان کردۆتەوە. راستی ئەمە، ئەوەیە کە ناوی

(28) سەعید صدقی و نوری عەلی ئەمین هەمان هەڵەیان کردووە.

بەرکاری لە چاوگی نادیارێوە بە فڕێدانی (نون)ەکەی دروستدەبێت، نەك لە (چاوگی نون کرتاوی)، کە وەك وتمان (مصدر مرخم)ی عەرەبی دەگرێتەوە[29].

لێژنە لە لاپەڕە (26)دا لەڕووی پێکهاتنەوە ناوی بکەریان بە سادە و لێکدراو داناوە و ئەمە راست نییە، چونکە ئەم بابەتە وشانە لە بەشێکی چاوگ و زیادییەك (پێشگر و پاشگر) پێکدێن و ئەمەش مەرجی رۆنانی وشەی دارِژاوە. لێژنەش دارِژاو و لێکدراوی ئەم ناوە بەرکاریانەی تێکەڵکردووە کە خۆی تەنها دوو شێوەی دارِژاو و لێکدراویان هەیە. لێرەدا بە پێویستی دەزانم دەربارەی ئەو ناوانەی کە پەیوەندییان بە بابەتەکەی ئێمەوەیە، واتە باسی (ناوی بکەر، ناوی بەرکار، ناوی چاوگ، ناوی جێگا، ناوی ئامێر) تێبینییەك بخەمە پێش چاو ئەویش ئەوەیە (ناوی چاوگ، ناوی ئامێر). نەبێت کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن و تەنها بەهۆی وەرگرتنی رەگی چاوگەکانیانەوە دروستدەبن، شێوەی سادەییان هەیە، وەك: (دز، پرس، گاز، گەز)، کە لە (دزین، پرسین، گازین[30]، گەستن)ەوە وەرگیراون، دەنا هەموویان دارِژاو و لێکدراون و سادەیان نییە، سەرنج راکێشە کە لێژنە لە لاپەڕە (29)دا جارێکی دی باسی ((ئاوەڵناوی کراو))ی هێناوەتە کایەوە و نموونەکانی وەك ((ترشاو، برژاو، ترساو)) یان بە ((ئاوەڵناوی کراو)) تۆمار کردووە، بێ ئەوەی روونیبکەنەوە بۆچی؟ ئەوەی پتر جێی سەر سورِمان بێ ئەوەیە، کە دواتر دەڵێن: دەشتوانین هەر ئەم ئاوەڵناوە کراوە تێنەپەرِانە بکەین بە تێپەرِ، پاش گواستنەوەیان بۆ چاوگی دالی بەهۆی ئامرازی (اندن)ەوە، ئەوسا پاشگری (راو) وەردەگرین وەك: (برژان-ان= برژ+ اندن= برژاندن- دن= برژان= برژێن+ راو= برژێنراو). (بروانە: ل 29). ئێمە نکوڵی لەوە ناکەین کە (ئاوەڵناوی بەرکاری) لەو چاوگە تێنەپەرِانەشەوە ساز دەدرێن، دوای کردنیان بە

---

(29) لە دێرِی چوارەمی لاپەڕە (14)ی ئەم کتێبەیاندا خۆیان لە ناو کەواندا (مصدر مرخم) یان بە چاوگی نون کرتاو داناوە.

(30) گازین: لە شێوەزاری هەندێ ناوچە بەکاردێ و دەڵێن گازیم، گازیت، گازی، گازیمان، گازیتان، گازیان: بۆ رابردوو. دەی گازم، دەت گازی، دەی گازی، دەی گازین... بۆ رانەبردوو.

تێپەڕی نادیار و بەهۆی پاشگری (و)ی بەرکارێوە ساز دەدرێـن. لـە سـەرەتاوە چـەند جارێك ئەمەمان راگەیاندووە. لە هەموو سەرنج راكێشتریش ئەوەیە، ئەو نموونانەی لە سەرەوە نیشانمان دان و كە بەلای لێژنەوە ئاوەڵناوی كراون و ئاوەڵناوی بكـەر نـین بـۆ ئەوەی روونیبكەنەوە دەیان كەن بە ئاوەڵناوی كراو، لە كاتێكدا (ناوی بـەركار) چـەند شێوەی جیاوازی دارشتنی هەیە. جا بۆیە ئێمە نموونەی خۆیان كە نیـشانماندا دەكـەین بە بەڵگەی راست و دروستی ئەم لێدوانەمان چونكە لە چـاوگی روودانـەوە وشـەكانی وەك (ترشاو، برژاو، ترساو) وەگیراون. شایانی باسە لێژنە ئەو رێژەیەی كە لـە قـەدی تێپەڕ و پاشگری (وو)ەوە وەك (كوشتوو، خواستوو، خـواردوو) بـە (نـاوی بـەركار)ی داناوە، بەڵام روونیان نەكردۆتـەوە بـۆ دەبنـە (نـاوی بـەركار) وەیـا ئەگـەر دەبنـیش رێژەیەكی كەم بەكارهێنراون و ژمارەشیان كەمە چـونكە ئەوانـە دەچـنە ریـزی وشـە مردۆكان (جامد)ەوە بەر شەپۆل و گۆڕانی پێـشكەوتنی زمانەكـە نەكـەوتوون و كـەم بەكار دەهێنرێن.

لێژنەی ناوبراو لەسەر باسی ((ناوی گوزارە))دا كـە لـە پـەراوێزدا هێمایـان بـەوە كردووە كە ((اسم معنى= الاسم المصدر))ە دواوە و ژمارەیەك نموونـەی (سـەربەخۆ) و هەنـدێكیش بـەهۆی (پاشـبەند)ەوە لـە (فرمـان، نـاو، ئاوەڵنـاو)وە هێناوەتـەوە و پێناسەیەكی بابەتەكەشی لە سەرەتاوە خستۆتە پێش چاو (بڕوانـە: ل 32-33). لـە لاپەڕە (35)دا لەژێر سەر باسی ((پێشگر و پاشگر))دا راسـت بـۆ ئـەوە چـووە كـە ((ڕەگی چاوگ)) دەبێتە بنەڕەتی دروستبوونی ((چاوگ، فرمان، ئاوەڵنـاو... هتـد))، بەڵام بۆ چوونەكەیان بەناوبردنی (ناو)یش زیـاتر راسـتی پێكـاوە. باسەكەشـیان لـەو وشانەوەیە كە پێشتر لێیان دواین و دووپات كردنەوەیە. ئەگەر چی هەندێك نموونـەیان بۆ ناو هێناوەتەوە و جۆری ناوەكەشیان لە ڕەگ و قەدی چـاوگەوەیە وەك ((پەسـتەك، وتار)) كە ناوی (ئامێر و ناوی چاوگ)ن تەنها وەكو ناوی ئاسایی ناویان بردووە.

پاش ئەم لێژنەیەی دانانی كتێبی زمان و ئەدەبی كوردی، كە لە سـەرەوە ناومـان برد، ساڵی 1976 لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی خوێندنی كوردییەوە لێژنەیەكی تر كەوتە

دانانی کتێبە کوردێکانی (زمان و ئەدەبی کوردی) بۆ پۆلەکانی قوتابخانە ناوەندی و ئامادەییەکان و سەر لە نوێ گۆڕینی ناوەڕۆکیانی گرتە ئەستۆ. لە ئەنجامدا شەش کتێبی بە ناوەڕۆك نوێی خستە بەردەست.

لێرەدا ئەوەی پێوەندی بە بابەتەکەی ئێمەوە هەبێت کتێبی ((زمان و ئەدەبی کوردی))ی پۆلی پێنجەم و شەشەمی ئامادەییە چونکە لە کتێبی ئەو دوو پۆلەدا لەو بابەتانەوە دواون کە جێگای مەبەستمانن. تێبینیشمان لەسەر چاپی حەوتەمی ساڵی 1982 دەبێت[31] کە دوا چاپێتی لەبەر دەستمان و تا ئێستاش هیچیان لێوە نەگۆڕاوە و تەنانەت بژارێکیش نەکراوەتەوە. لە کتێبی پۆلی پێنجەمی ئامادەییدا لە لاپەڕە (26-30)دا لە (ئاوەڵناوی بکەری داڕژاو) دواون. لە لاپەڕە (31-33)شدا باسی (ئاوەڵناوی بکەری لێکدراو)یان کردووە. لە لاپەڕە (34-37) لە (ئاوەڵناوی کراوی داڕژاو) کۆڵیونەتەوە. لە لاپەڕە (38-41) دەربارەی (ئاوەڵناوی کراوی لێکدراو) توژیونەتەوە. بەگشتی ڕێبازی لێکۆڵینەوەکەیان سەرکەتووە. لە بەشی (ئاوەڵناوی بکەری داڕژاو)دا لایەنی چاکی باس و کەموکوڕیش دەبینین. جا بەم شێوەیەی خوارەوە لێیان دەدوێن و دەسنیشانیان دەکەین:

1- ئاوەڵناوی بکەریان لە چاوگیش و ناویشەوە وەرگرتووە و بە نموونەوە لە هەردوو جۆرەکەی دواون و بەخشتەش نموونەکانیان جیاکردۆتەوە. بێگومان ئەمە ڕێبازێکی هەرە چاکی لێکۆڵینەوەیە کە پەیڕەویان کردووە، بەڵام وشەی ((دز)) کە (ناوی چاوگ)ەو لە چاوگیشەوە وەرگیراوە، بە ئاوەڵناوی بکەریان داناوە.

2- بەتایبەتی نموونەکانی وەك ((گەڕۆك، کوشندە بخۆر، بکەر)) کە پێویستیان بە ڕوونکردنەوەی خەست هەیە، لیژنە بەوەندە باسەکەی بڕیوەتەوە کە وتوویە:

---

(31) عەبدوڵلا شاڵی، نوری عەلی ئەمین، کەمال مەحموود فەرەج، ئەبو زەید سندی، عەلائەدین سەجادی، د. عیزەدین مستەفا رەسول، د. ئەمین عەلی، فەرەیدوون عەلی ئەمین، زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، هەولێر، 1982، بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی، هەولێر، 1982.

((وشەکانی تری ریزی ژمارە (1) هەموویان لە ڕەگی فرمان و پێشگرێك یان پاشگرێك یان هەردووکیان پێکهاتوون)) (بڕوانە: ل 27). نووسەران بۆ ئەو ئاوەڵناوە بکەریانەی وەك ((گەڕۆك))، کە لە چاوگی ((گەڕان))ەوە وەرگیراون، دەبوایە هێمایان بەوە بکردایە کە لە وەرگرتنی ڕەگەکەیەوە دەنگی (ا) یەکەی دەگۆڕێ بە (ێ) و پاشان لە دروستکردنی وشەکەیدا کە ((گەڕۆك))ە (ێ) تێدەچێت، چونکە دەچێتە پاڵ بزوێنی (ۆ)ی پاشگری (ۆك)ەوە. هەروەها لە (کوشتن)دا ڕەگەکەی دەبێت بە (کوژ) بە گۆڕانی (ش)ی کپ بۆ (ژ)ی ئاوازەدار و جارێکی تریش لە وشەی ((کوشندە))دا بۆتەوە بە (ش)، چونکە چۆتە پاڵ دەنگی (ن)ەکە، لە وشەکانی ((بکەر، بخۆر)) کە ئاوەڵناوی بکەری داڕژاون، دەبوایە وەکو لە سەرەتاوە روونمان کردەوە، بێجگە لە پێشگری (بـ) کە نیشانەی داڕشتنی (ئاوەڵناوی بکەری داڕژاو)ن کە لە ڕەگی فرمانی تێپەڕەوە وەردەگیرێن، وەکو (بکوژ، بکر، ببر، بکڕ) کە لە چاوگی (کوشتن، کردن، بردن کڕین)ەوە وەردەگیرێن، کە لە ڕەگی (کە+ەر، خو+ەر) پێکهاتوون و لە پاشاندا بزوێنی (ە)کەیان تێدەچێت.

پاش ئەمە هاتوونەتە سەر (ئاوەڵناوی بکەری لێکدراو) و ئەوەیان روونکردۆتەوە کە ئەم ئاوەڵناوە بکەریانە لە ((وشەیەکی واتاداری سەربەخۆ و پاشگرێك یان پێشگرێك پێکدێن، پێیان دەگوترێت ئاوەڵناوی بکەری لێکدراو... کە هەریەکەیان لە چاوگێکی لێکدراوەوە وەرگیراون)) (ل: 31-32). ئەوەشیان راگەیاندووە کە ئەم وشانە لە ئاخاوتن و نووسیندا بەپێی ئەرك و شوێنیان وەکو ناویش و ئاوەڵناویش بەکاردێن. ئاشکرایە، ئەمەش رادەی رێباز و باسەکەیانی بەرزتر کردۆتەوە. بەتایبەتی چونکە پەنجەیان بۆ ئەوە درێژ کردووە: ((ئەو پاشگرانەی کە دەبنەهۆی دروستکردنی ئاوەڵناوی بکەری داڕژاو، بۆ ئەم مەبەستەش (واتە بۆ ئاوەڵناوی بکەری لێکدراو) بەکاردێن[32]. لەگەڵ ئەو سەرکەوتوویيەشدا لێرانەشدا هەندێك هەڵە روویداوە بەڵام

---

(32) بڕوانە پەراوێزی ژمارە (1)ی لاپەڕە (32)ی کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، 1982.

هەمان هەڵەی بەشی (ئاوەڵناوی بکەری دارِژاو)ن و سەرنجی ئێمەش لـە لەبارەیانـەوە هەمان سەرنجە لە شوێنی خۆیدا خستوومانەتە ڕوو. دوا بـەدوای ئەمـە لـەژێر باسـی ((ئاوەڵناوی کراوی دارِژاو))، ((ئاوەڵناوی کراوی لێکدراو))دا باسی نـاوی بـەرکاریان بەرێکوپێکی ئەنجامداوە. لێرەدا تـەنها هەڵەیـەکیان کـردووە، ئـەویش هـەروەکو لـە هەڵسەنگاندنی سەرچاوەکانی لەمە پێشەوە خستمانە ڕوو. بریتییە لەوەی کە نەدەبوو وا بە ئاسانی بەسەر لێژنەدا بڕوات، ئەوەیە، ڕێژەیەکی (ناوی بکـەری دارِژاو) کـە لـە چاوگی تێنەپەڕی گوێزانەوە وەردەگیرێ، وەکو (کەوتوو، چەقیو) لەگەڵ هەمان ڕێـژەی (ناوی بەرکار) کـە لـە قـەدی چـاوگی تێنەپـەڕی ڕوودان و پاشـگری (و)ی بـەرکاری دروستدەبێت تێکەڵکردووە. چونکە ئەم ڕێژەیەی دووەمیان هەروەکو لەمـەو پێـشەوە روونمان کردەوە لە خۆیەوە ڕوونادات و پێویستی بە بکەر هەیە و چمکێکی کارەکە یـا هەمووی بەسەریاندا هاتووە و نەك کارێکیان کردبێت تا ببنە بکەر. بۆیە ئەوەی کاری بەسەردابێت وەکو (برژاو، سووتاو، مـردوو) (بڕوانـە: ل34) دەبنـە (نـاوی بـەرکاری دارِژاو) چونکە ئەمانە ئەگەرچی بەلای لێژنەشەوە ناوی بەرکارن بـەڵام لەبـەر ئـەوەی تێکەڵ بەرێژە ناوە بکەرێکەی سەرەوە کراون بۆ لێژنە بە کەموکوڕی دەژمێررێت و لـە ئاستی کارەکەیان دەهێنێتە خوارەوە. کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی شەشـەمی ئامادەیی لە بەشی ((ئاوەڵناوی دارِژاو، ئاوەڵناوی لێکدراو))دا، نەك وەکـو باسـێکی سەرەکی، بەڵکو لەنێو باسەکەیانەوە بە باسێکی تێکـەڵ ئاوڕیـان لـە (نـاوی بکـەری دارِژاو، نـاوی بکـەری لێکـدراو، نـاوی کـراوی دارِژاو، نـاوی کـراوی لێکـدراو) داوەتـەوە(33)، کـە مەبەسـتی سـەرەکییان (ئاوەڵنـاو لـەڕووی دارِشـتنەوە)ویـە. نموونەکانیشیان لە ((ناو، ئاوەڵناو، فرمان))ەوە بۆ هەر سێ جۆرەکەی ئاوەڵناوی سادە و دارِژاو و لێکدراوە.

لێرەدا لێژنە کـەمووکوڕی داوە بەدەسـتەوە چـونکە ئـەم بابەتانـەی لـە سـەرەوە خستماننەڕوو بابەتی سەربەخۆن و لە چاوگیشەوە وەردەگیرێن. بۆیە نابێت وەکو لێژنە

---

(33) بڕوانە لاپەڕە (54-64)ی سەرچاوەی سەرەوە.

ئەم بابەتانە بخاتە نێوباسی ترەوە، چونکە (ناوی بکەر، ناوی بەرکار) بە هەردوو لایەنی ناوی و ئاوەڵناوییانەوە نابێت وەکو ناوی یا ئاوەڵناوی ئاسایی لێیانەوە بکۆڵرێتەوە لەیەر سەربەخۆیی بابەتەکانیان.

کتێبی ((رێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لێژنەی زمان و زانستەکانی)) کۆڕی زانیاری کوردی سەرچاوەیەکی بەکەڵك و نموونەییە بەوەی لە هەموو بەشەکانی ئاخاوتنەوە بە بەرچاو گرتنی بیروڕای رێزمان نوسانی پێشوو ترەوە بە فراوانی دواوە[34].

لێرەوە روو دەکەینە مەبەستی باسەکەمان کە لێژنەی ناوبراو لە ژێر ناونیشانی ((ئەو واژانەی کە لە (کار) وەردەگیرێن:... بۆ دەربڕینی مەبەستی جۆرجۆری ئاخاوتن ئەمانەن: ناوی کارا (ناوی بکەر)، ناوی بەرکار، ناوی چاوگ، ناوی جێگا، ناوی ئامێر...)) (بڕوانە: ل 243-244) بە چاکی و فراوانی لێیانی کۆڵیوەتەوە. لەڕاستیدا تاکو ئێستا، تاکە باسێکی سەر پشکە، کە بەو جۆرە لەو بابەتانەی سەرەوە کە لە چاوگیشەوە رۆدەنرێن، کرابێت. لە چاو کارەکانی پێشتردا زۆر سەرکەوتووە. ئەو باسانەی زووتر لەم بارەیەوە نووسراون و نیوە چڵن و بەزۆری لایان لە ناوی بکەر و ناوی بەرکار کردۆتەوە و جۆرەکانی وەکو (ناوی چاوگ[35]، ناوی جێگا، ناوی ئامێر)[36]یان فەرامۆش کردووە. یاخود تێکەڵکراون لە تەك (ناو)دا باسکراون و لەگەڵ شێوە سەربەخۆکانیان وێڕای ئەوە چەند نموونەیەکی کەم هێنراوەتەوە، ئەویش بێ روون کردنەوەی رێگای پێکهاتنیان لەگەڵ ئەو رێکی و پێکییەشدا چەند کەموکوڕییەك دەبینرێن و وا بە نیازی راستکردنەوەیان دەیان خەینەڕوو:

---

(34) رێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لێژنەی زمان و زانستەکانی، بەغدا، 1976.

(35) لە کتێبی ((زمان و ئەدەبی کوردی)) پۆلی سێیەمی ناوەندیساڵی 1972، باسی (ناوی چاوگ)یان کردووە، لە شوێنی خۆی لە پێشەوە خستمانەڕوو.

(36) جگەر خوێن لە ((دەستورا زمانی کوردی)) ساڵی 1961 وەکو لەمەوبەر خستمانەڕوو لە بارەیانەوە دواوە، بەڵام تێکەڵ و نارێکە.

1- فەرامۆش کردنی پێناسەی هەموو بابەتەکان و وەرگرتنی ئەو بابەتانە لە چاوگەوەیە نەك لە فرمان.

2- بەشێوەی نووسەرانی پێشوو، ناوی بکەریان لە قەدی چاوگی تێنەپەڕی گوێزانەوە و روودانیش وەرگرتووە و تێکەڵیانکردووە. وەکو لە سەرەتاوە روونمان کردەوە (ناوی بکەری داڕژاو) لە قەدی تێنەپەڕی گوێزانەوەوە وەردەگیرێت. بەڵام لە قەدی تێنەپەڕی روودانەوە (ناوی بەرکار) وەردەگیرێت، کە لێژنە هەردوو جۆرەکەی بە (ناوی بکەر)ی زانیوە، (بڕوانە: ل244).

3- لە باسکردنی رێگای دروستبوونی بابەتەکاندا کە لەسەرەوە دەسنیشانمانکردن، بەدەگمەن نەبێ باسی ئەوەیان نەکردووە، کە هەندێك لەو ناوانە لە ڕەگی چاوگەوە و هەندێکی تریان لە قەدی چاوگەوە وەردەگیرێن بە لادانی نیشانەی چاوگ و (نونی) چاوگ کە هەریەکەیان سەر بەدروستکردنی رێژەییەکی تایبەتین لەو ناوانەی کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن. ئەمە بێجگە لەو گۆڕانەی لە ئەنجامی دەنگ سازییەوە بەسەریاندا دێ لە کاتی وەرگرتنیان لە چاوگەکەوە بە گۆڕانی دەنگی نەبزوێنی کپ بۆ دەنگی ئاوازەدار، وەکو ڕەگی ((کوشتن، گەستن)) کە ((کوژ، گەز))ە، بڕوانە خاڵی ژمارە (1) و ژمارە (6)ی لاپەڕەی (248-249). هەروەها ناو نەبردنی (ەر، و) کە پاشگری ناوی بکەر و ناوی بەرکاریان وەکو نیشانە یا هەر شتێکی دیکە.

4- تێکەڵکردنی ڕەگی فرمانی داڕژاو، کەرتی کار، نیشانەی (ەر)ی ناوی بکەری بەکەرتی کار هەڵەیە. کە دەڵێن ((ناوی کارای نسادە)) هەیە لە کوردیدا کە لە کاری تێپەڕ وەردەگیرێت، چ لە پێشگر و کەرتێکی کار چ لە وشەیەکی واتادار کەرتێکی کارەکە بێت، بۆ نموونە: هەڵگرتن — هەڵگر، تێکردن- تێکەر، لێنان- لێنەر، نان خواردن- نان خۆر، سەرتاشین- سەرتاش، جل شۆر)) ((ل249-250)).

راستی ئەو هەلانە ئەوەیە، ناوە بکەرێکانی (هەڵگر، سەرتاش، جلشۆر) ڕەگی. چاوگە داڕژاو و لێکدراوەکانیان بەلادانی نیشانەی چاوگەکانیان دروست بوونە.

وشەکانی (تێکەر، لێنەر، نانخۆر)یش کەرتی فرمانی نین و بەڵکو راستێکەی لە ڕەگی چاوگەکانیان کە بریتین لە (تێکە، لێنێ، نانخۆ) و نیشانەی (ەر)ی ناوی بکەری پێکهاتوون، بەڵام لە ئەنجامی لێکدانی هەردوو دەنگی (ە)ی بزوێن و یەکێکیان تێچووە. لە دووەمدا دەنگی (ی) ڕەگی (لێنان)ە لەگەڵ (ە)ی (ەر)دا لێکیان داوە و نەماوە و لە (نان خۆر)یشدا دەنگی (ە)ی نیشانەی (ەر)ی بکەرەکەی چۆتە سەر دەنگی (و)ی رەگەکە لە ناوچووە[37].

5- فەرامۆشکردنی باسی دەنگسازی لە کاتی وەرگرتنی نموونەکان لە چاوگەکانیانەوە لەڕووی گۆڕانی دەنگی کپ بۆ دەنگی ئاوازەدار، بڕوانە خاڵی (1، 3، 4، 5)ی لاپەڕە (248-249) لە وەرگرتنی ڕەگی (کوژ، گەز)ی چاوگی ((کوشتن، گەستن)) پێوەندییێکی بتەوی بە باسی وشەسازی (مۆرفۆلۆژی)یەوە هەیە و نابێ پشتگوێ بخرێت.

6- جیاوازی نەکردنی لێژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ لە نێوان ناوی چاوگ و ناوی بکەریدا و لەنێوان نیشانەی (ا ر) و (یار)دا کە یەکەمیان (ا ر)ە و دەچێتە سەر قەدی چاوگ بەلادانی (نون)ەکەی (ناوی چاوگ) دروستدەکات و تایبەتە بە ڕۆنانی ئەم ناوە هەرچی (یار)ە دەچێتە سەر ڕەگی چاوگ بەلادانی نیشانەی چاوگە کە و ڕێژەیەکی ناوی بکەری لە ڕەگی چاوگی تێپەڕەوە پێکدەهێنێت نەك وەکو لێژنە دەڵێ ((... ڕێکەوت ئەو (ی) خستۆتە پێش (ار)ەکەوە، بۆ نموونە: بڕین: بڕی — بڕیار، دزین: دزی-دزیار، پرسین: پرسی- پرسیار،...)) (ل259). ئایە ئەو (ی)یەی پێش نیشانەی (ار)ی ناوی چاوگی، ڕێکەوتە، یا بنەڕەتی و بنجییە و دەنگی قەد و نیشانەی چاوگە (یائی)یەکانە؟ لە وەڵامدا وەکو لەسەرەوە خستمانە روو بوونی دەنگی (ی) لە تەك (ار)دا هی قەدی چاوگەکەیە و بەوەوە لە (یار)ی ناوی بکەرێوە

---

(37) بڕوانە: محەمەد ئەحمەد سەعید، وتاری ((چەند سەرنجێکەی زمانەوانی دەربارەی کتێبی ڕێزمانی کوردی))ی دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف، گۆڤار ((ڕۆشنبیری نوێ))، ژمارە (93)، بەغدا، ساڵی 1983، ل 41-42.

جیادەکرێنەوە. بۆ نموونە بڕوانە (کوشتار، کردار، وتار) ناوی چاوگن و نیشانەی چاوگەکانیان کە (تائی، دالی)ین لە قەدی (کوشت، کرد، وت) بەهۆی پاشگری (ار)ەوە ئەم ڕێژە (ناوی چاوگ)ییەی سەرەوە پێکهاتووە. بەمە روون دەبێتەوە و ئاشکرا دەبێ دەنگی (ی) لە چاوگە (یائی)یەکان و نموونەکانی کۆڕدا، کە لەسەرەوە خستمانەڕوو، وەکو لە (بڕین، دزین، پرسین)دا کە (ناوی چاوگ)ی (بڕیار، دزیار، پرسیار) لێیانەوە لە قەدی چاوگ و پاشگری (ار)ەوە بەم شێوەیە پێکهاتووە: (بڕی+ ار= بڕیار)، (دزی+ ار= دزیار)، (پرسی+ ار= پرسیار) ڕێکەوت نییە دەنگێکی بنجی قەدی چاوگەکانە. ئەمجا ئەو (ناوی بکەر)انەی کە بەهۆی پاشگری (یار)ەوە دروستدەبن و لە ڕواڵەتدا لەو (ناوی چاوگ)یانەی سەرەوە دەچن و نزیکن، لەڕەگی چاوگ و پاشگری (یار)ەوە بەم شێوەیە رۆدەنرێن:

کڕین: کڕ+یار= کڕیار

نووسین: نووس+ یار= نووسیار[38]. لە ناوی چاوگی یائیدا (ی) هی قەدی چاوگەکانە نەك هی پاشگری (ار) یا ڕێکەوت بن.

هەروەها لیژنە هەر لە لاپەڕە (259)دا وای نیشانداوە لە ناو چاوگە (یائی)یەکاندا تەنها (کڕین) لەم ڕێژەیەدا (ناوی بکەر)ی (کڕیار)ی لێوە وەردەگیرێ. ئەمە راست نییە، چونکە لە چاوگی (یائی) تریشەوە وەکو (نوسین، سڕین)، ناوی بکەری (نووسیار، سڕیار)ی[39] لێوە وەردەگیرێت.

---

(38) بروانە: نووری عەلی ئەمین، دەوری پیتە بزوێنی (ە) لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری ((رۆشنبیری نوێ، ژمارە (111)، بەغدا، 1986، ل 181.

(39) مەسعوود محەمەد لە ل(228)ی گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (111)ی، 1986دا، ئەوەی نیشانداوە، تەنها (کڕیار) هەیە لە تەك (فرۆشیار)دا کە بەهۆی پاشگری (یار)ەوە (ناوی بکەر) بن. لە راستیدا بوونی ناوی بکەری تری لەم ڕێژەیەدا وەکو (نووسیار، خوازیار، سازیار، وتیار، پارێزیار... هتد ئەم بۆچوونەی مامۆستا رەت دەکاتەوە، بۆ ئەم راستییە بڕوانە سەرچاوەی پەراوێزی پێشوو، ل (181).

لیژنه لەلاپەڕە (263)دا ((ریژەن)) کە (نـاوی جێگـا)یـە لـە چـاوگی (ڕژان)ەوە وەرگرتووە، راستێکەی لە چاوگی (ریشتن)ەوە رۆدەنرێت و ڕەگەکە (ریـژ)ە و پاشـگری (ەن) دەیکاتە (ناوی جێگا). هەرچی (ڕژان)ە ڕەگەکەی (رژێ)یـە نـەك ((ریـژ))، کـە ڕەگی (ریشتن)ە.

لیژنــە لــە بەشــی ((نـاوی ناسـادە))دا نموونـەکانی دووبـارەن و دەچـنەوە ریـزی بابەتـەکانی تریانـەوە. بەوێنـە نموونـەکانی ((دەسـتماڵ، لاگـیرە، بەرچـنە، دەزگـرە، دەستکێش، پێخەف، رایەخ، رووپۆش، سەرپۆش)) (ل265)، (ناوی ئـامێر)ن و هـەر لەم باسـەدا لـە لاپـەڕە (263-265)دا لیـوەی دواوە، ئـیتر وەکـو باسـێکی تـازە پێویستی بە دووبارە بوونەوە نەدەکرد.

لە لاپـەڕە (83-84)ی هـەمان سەرچـاوەدا مەسـعوود محەمـەد بـیروڕای خـۆی لــەبارەی (نــاوی بکــەر) لــەڕووی پێکهاتنــەوە رایگەیانــدوە و ئاوەڵنــاوی لــە نــاو جیاکردۆتەوە بەوەی ناو ریژەی ((اسم فاعل مرکب))ی نییە. پێکهاتنی ئـەم وشـانەی بەوە لێکداوەتەوە کە لە (ڕەگی چاوگ) و زیادەیەك پێکدێن و زۆر راستی بۆچووە کـە ڕەگ دەبێت مامەڵەی واتاداری لەگەڵدا بکرێـت، لەبـەر ئـەو هێـزەی کـە تێیدایـە و دەبینی ئەگەرچی واتاش نابەخشن بەڵام لەگەڵ زیادییەکی بێ واتادا وشەیەکی واتادار پێکدێنن وەك (لێخوڕ) کە نووسەر ناویان نانێت چی پێ بڵـێن لـەڕووی پێکهاتنـەوە، بەلایەوە فرمانەکان چ شێوەیەکیان هەبێت ئەم وشانەش هەروا دەبـن. بـەلای منـەوە ئەمە کەموکورتییە لەڕای مامۆستا مەسعووددا و بێ سێ و دوو دەڵێم (ناوی بکـەری داڕژاو)ن چونکە مەرجی وشەی داڕژاو ئەوەیـە لـە وشـەیەك و زیادەیـەکی بـێ واتـا پێکبێت، ئیتر هیچ گرفتێکی ناوێ کە پێی بڵێین ناوی بکەری داڕێژراو. جا مامۆسـتا مەسعوود محەمەد بۆ ئەمە بە گرفت دادەنێت کە یەکسەر داڕێـژراویان پێـی بوترێـت، وەکو یەکسەر بەشی لێکدراوی ناوی بکەر و نـاوی بـەرکاریان بەلایـەوە ناونـانی بـێ گرفتە.

پاش بیروڕاکانی مەسعوود محەمەد لەو سەرچاوەیەدا دەربارەی ناوی بکەر و ناوی بەرکار خستمانە پێش چاو و بیروڕای خۆمانمان لە بارەیەوە دەربڕی، ئینجا روو دەکەینە وتارێکی تری کە بە ناونیشانی ((کۆڕی زانیاری کورد)) چۆن ئەم ناوەی وەرگرت؟ کە تێیدا چۆنیەتی ناونانەکەی (کۆڕ)ی لەڕووی وشە سازێوە روونکردۆتەوە(40). ئەم لێکۆڵینەوەیە بابەتەکەی ئێمەشی گرتۆتەوە و بە خەستی لەو (ناوی بکەر) و (ناوی چاوگ)انەی لە چاوگەوە بە یارمەتی پاشگری (یار) و (ار)ەوە دروستدەبن کۆڵیوەتەوە و تارادەیەکی زۆر ئەو کێشەیەی کە لە نێوان ئەو دوو جۆر وشەیەی (ناوی بکەر و ناوی چاوگ)ەوە کە بەهۆی ئەو دوو پاشگرەوە پێکهاتوون روونکردۆتەوە بەوەی کە (ناوی بکەر) بەهۆی پاشگری (یار) و (ناوی چاوگ)یش بە (ار) پێکهاتوون. بە مەدا مامۆستا مەسعوود محەمەد کێشەیەکی ئاڵۆزی لەنێوان ئەو چاوگە (نووسەر دەڵێ فرمان) (یائی) یانەی کە (ناوی بکەر و ناوی چاوگ)یان بەهۆی ئەم دوو پاشگری (یار) و (ار)ەوە لێ پەیدا دەبێت بەوەی کە لە ڕواڵەتدا، (کڕیار) کە (ناوی بکەر)ە لە (ناوی چاوگ)ی (پرسیار، دزیار، بڕیار) دەکات ئاسان کردۆتەوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا کەلێنی ئەو کێشەیەی هێشتۆتەوە، کە پێویستی بە پڕکردنەوەی تەواو و دارماڵ هەیە.

بێجگە لە دیاریکردنی ئەو دوو پاشگرە کە (یار) (ناوی بکەر) دروستدەکات و (ار)یش (ناوی چاوگ)، مامۆستا بۆ جیاکردنەوەی تەواوی ئەو دوو جۆرە وشەیە دەڵێ: ((... ئەگەر وشەیەك لە ئەسڵدا پیتی (ی) تێدابوو وەك (ناسیار، پرسیار، بڕیار) کە بنچینەیان (ناسین) و (پرسین) و (بڕین)ە و بە سێ پیتی (ی. ا. ر) دواییان دێت لەگەڵ ئەمەشدا مانای (اسمی فاعل)ی نەبەخشی دەبێ بە حوکمی (منطق و قیاس)

---

(40) مەسعوود محەمەد، کۆڕی زانیاری کورد چۆن ئەم ناوەی وەرگرت؟ گۆڤاری زانیاری، ژمارە (4)ی ساڵی 1971، ل 57-71.

بڵێین ئەم (ی)ەی کەوا تێیدا هەیە بنچینەییە، نەك پێوەی لکاوە، و ئەوەی لێی زیاد کراوە دوو پیتی (ا. ر)ەو بەس))[41].

سەرنجی نووسەری وتار کە ئەمانەی سەرەوە (ناوی بکەر) نین و بە (ار) دروست دەبن و پیتی (ی) یەکەیان بنچینەییە راستیی راکەی گەیاندووە، بەڵام کوا حوکم و قیاسی دەربارەی سەلماندنی بنچینەیی ئەو (ی)یە کە لکاو نییە؟ بڕیاری راستی ئەوەیە بڵێین ئەم وشانە کە (ناوی چاوگ)ن لە قەدی چاوگەوە دوای فڕێدانی (ن)ی چاوگەکە و لکاندنی پاشگری (ا ر)ەوە دروستدەبن. ئەمە نەك تەنها لە چاوگە (یائی)یەکانەوە، بەڵکو هەموو (ناوی چاوگ)ێك بەم جۆرە پێکدێت: وەك:

| ناوی چاوگ | پاشگر | قەد | چاوگ |
|---|---|---|---|
| ناسیار | ار | ناسی | ناسین |
| پرسیار | ار | پرسی | پرسین |
| کردار | ار | کرد | کردن |
| کوشتار | ار | کوشت | کوشتن |

ئەو ناوە بکەریانەی بە پاشگری (یار) دروستدەبن وەنەبێ هەر بچنە سەر رەگی چاوگی (یائی)، بەڵکو وەنەبێ زۆربەی چاوگەکانی تری نا (یائی)یشەوە، دەلکێ:

| ناوی بکەر | پاشگر | ڕەگ | چاوگ |
|---|---|---|---|
| کڕیار | یار | کڕ | کڕین |
| نووسیار | یار | نووس | نووسین |
| خوازیار | یار | خواز | خواستن |
| فرۆشیار | یار | فرۆش | فرۆشتن |

(41) سەرچاوەی پێشوو، ل65.

بەمەدا روون و ئاشکرا دەبێ، مانەوەی (ی)یەکە لە (ناوی چاوگ)دا نیشانەی قەدی چاوگەکەیە و بەهۆیەوە لەو (ناوی بکەر)یانەوە جیا دەکرێنەوە کە لە ڕەگی چاوگەوە بەلابردنی نیشانەکەی کە (ن) و دەنگەکەی پێشێتی نەك بەلای نووسەری وتارەوە دوو دەنگی (ی) لە (ناوی بکەر)ی (کرپیار)دا کۆ دەکاتەوە و لەبەر نەگونجانی دوو (ی) پێکەوە لە ڕێزمانی کوردیدا یەکێکیان تێدەچێت بەشێوەی (ی)ی ئیزافە کە بچێتە سەر ناوێکی بە (ی) کۆتایی هاتوو بەیەك دەنووسرێن[42]. ئەمە لەگەڵ هەڵکەوتی زمانی کوردیدا ناگونجێ و لە سەرەوە ڕاستییەکەمیان خستەڕوو. پاشان لە لاپەڕە (67)دا وشەی (زانیار)ی[43] بە (ناوی چاوگ) داناوە، کە ئەمە ڕاست نییە،

---

(42) بڕوانە دوا پەرەگرافی لاپەڕە (64)ی سەرچاوەی پێشوو.

(43) مامۆستا مەسعوود محەمەد لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێی ژمارە (111) و (112)ی ساڵی 1986دا (ل 220-272) و (ل160-210)، لە ژێر ناونیشانی ((زاراوە سازیی پێوانە))دا نووسەر بە درێژی باسی دانان و داڕشتنی زاراوەی کوردی دەکات لە ڕێگای پێوانە و داڕشتنەوە. بەگشتی لێکۆڵینەوەیەکی تابڵێی چاك و دەگمەنە لەناو وتارەکانی زمانەوانیدا. لەم وتارەدا نووسەر لای لەو وشانەش کردۆتەوە کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن تاکو بۆ زاراوە دابنرێن و ئەوەی ڕاگەیاندووە کە ڕێژەی هەندێکیان ناوی بکەری داڕژاو و لێکدراو، ناوی بەرکاری داڕژاو و لێکدراو، ناوی چاوگ، ناوی جێگا، ناوی ئامێرن. بەگشتی نموونەکانی ئەگەرچی لەڕووی پێشنیارکردنی زاراوەکانێوەیەتی کە دایناون، بەڵام ڕێکوپێکن بە تایبەتی لەڕووی داڕشتن و وشە سازێوە. نموونەی بۆ ئەو ناوانەی هێناوەتەوە کە لە سەرەوە خستماننە بەردەم و بە یاریدەی پاشگرەکانی ((و، ە، ب، وەك، یار، ەر، نۆك، ەوار، ار، ەك، کە، ەن...)) ساز دەبن و چالاکن لەڕووی داڕشتنی وشەکانی سەرەوەدا. هەروەها دەوری (نە)ی نەرێ وەکو پێشگر لە رۆنانی (ناوی بکەری داڕژاو)دا باس کردووە، ئێمە لێرەدا تەنها ئەو پاشگرانەمان پیشاندا کە بابەتەکانی سەرەوە دەگرنەوە.

لە لاپەڕە (228)ی ژمارە (111)دا تووشی ئەو هەڵەیە بووە، کە ((زانیار، نووسیار))ی بە ناوی چاوگ (ناوی واتایی) داناوە. لەڕاستیدا وەکو لەمەو بەر روونمان کردەوە ئەو دوو (ناوی چاوگ)ە لە

چونکە ئەم وشەیە لەبەر بەهێزی لایەنی بکەرێتی (فاعیلیەت) تێیدا بۆ خاوەنەکەی کە هەڵگری زانست و زانیارییە، دەچێتە ریزی (ناوی بکەر)ێوە، وەك لە سەرەوە بە نموونەوە روونمان کردەوە، (زانیار)یش بە شێوەی ئەوانە لە ڕەگی چاوگی (زانین)ەوە وەرگیراوە، کە (زان)ە و پاشگری (یار)ی بکەری کردوێتی بە (ناوی بکەری داڕژاو). بۆ زیاتر روون بوونەوە دەوترێ (فلانە کەس زانیارە) واتە زانایی هەیە و بکەرێتی لەگەڵ کارەکەیدا هەیە، وەك (کڕیار، خوازیار، نووسیار، وتیار)، کە ناوی بکەرن. وەکو هەموو ناوێکی بکەر بە هۆی پاشگری (ی)یەوە دەکرێتە ناوی واتایی (ئەبستراکتی) کەچی ناوی چاوگ نابێتە ناوی واتایی وەکو (پرسیاری).

---

ڕەگی (زان، نووس) و پاشگری (یار)ی بکەری پێکهاتوون و (ناوی بکەری داڕژاو)ن. هەروەها لە هەمان لاپەڕەدا تەنها ((کڕیار)) بە ئاوەڵناو داناوە، کە لە چاوگ و (یار) بە سوانی یەك لە (ی) یەکانی دروستبووە وەکو لە پێشەوە نیشانماندا ئەمە هەڵەیە و (ناوی بکەر)ی دی لەو شێوەیە هەیە، وەك: (نووسیار، زانیار)، کە دەنگی (ی) نەسواوە، بەڵکو لە ڕەگی (کڕ+یار)ەوە دروستبووە، کە ئەوە رێژەیەکی تایبەتی لە (ناوی بکەر) پێکدێنێت. نووسەر زۆر بە باشی بۆ ئەوە چووە کە (ناوی بکەری لێکدراو) لەبەرئەوەی تەواو پێکەوە جۆش خواردوون و تەنانەت هەندێ (ناوی بەرکار)یش پێکەوە بنووسرێن چاکە، وەك ((جلد روو، ماڵدز، بانگدەر، گورگخۆرە))، بەڵام هەڵەیەکی تری کردووە کە ڕەگی چاوگە تێپەڕەکانی وەك (رژێن، خنکێن، کولێن...)ی بە ناوی بکەر لەقەڵەمداوە. لە لاپەڕە (164)ی ژمارە (112)دا لە چاوگی داڕژاوی کە بە ((لا)) بوونەتە (داڕژاو) ناوی بکەری وەك (لادڕ، لاکوت، لاگیرە) لێوە ڕۆناوە، بەڵام دەڵێ کەس نەیبیستووە بڵێن ((لادەر، لابەر، لاکەرەوە)) گەڕان بە نووسینی کوردییدا رای نووسەر بەلاوە دەنێ و ئەوە نیشاندەدا کە ئەو جۆرە لەمەو پێش بیستراون. بۆ نموونە ئەو کەسەی لەسەر بڕواو رێبازێك کە باوەڕی پێی هەیە و کردەوەی یەك نییە پێی دەڵێن (فلانە کەس لادەرە) یا (فلانە پارت لادەرە). هەروەها (لابراو، لا خوراو، لادراو، لادیتراو) کە نموونەی نووسەرن ئەمانیش بیستراون و بەکاریش دێن.

کتێبی ((چەند حەشارگەیێکی ریزمانی کوردی)) کە لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردە[44] و نووسەرەکەی تێیدا خۆی واتەنی لایەنی باس نەکراو و حەشاراوی بۆ یەکەم جار خستۆتە بەرچاو، کە لەوە پێشەوە، لە حەشارگەی رێزمانی کوردیدا خۆی حەشار داوە وەك گۆڕینی ئەرکی (راناوی لکاو) لە ئالۆگۆڕکردنی کاتی فرمانەکەی لە بکەرەوە بۆ بەرکار و بە پێچەوانەوە، لەگەڵ هەندێك (حەشارگەی پاشگرەکانی ((کار))) و حەشارگەی (فعلی انتقالی) و ناوگر. کە تیایاندا بەتایبەتی لە ((حەشارگەی پاشگری ((کار))دا) لای لە هەندێ کێشەی (ناوی بکەر و ناوی بەرکار) کردۆتەوە، کە بەلای ئێمەوە هەندێکی راستە و لەگەڵیداین و ئەوەشی جێگای کەموکوڕی و سەرنجە دەیخەینە پێش چاو: لە لاپەڕە (18-19)دا دەربارەی پاشگر بوونی (ا) لەو فرمانانەی وەك (ترسا، سووتا، نووسا، بڕژا...) کە رێژەی رەسەنی روودانن، نەك دەنگێکی بنجی گەردانی پیتی بنەڕەتی وشە بن، دواوە و بەڵگەشی نەمانی دەنگی (ا)ی ئەو فرمانە تێپەر و تێنەپەڕە ئاساییانەیە، کە رووداو نین و نموونەکانیشی وەك ((کێلاّم- دەکێڵم، هێنام- دەهێنم، راوەستام- رادەوەستم...))ە و رێژەی (ناوی بەرکاری لێکدراو)ە نەك (ناوی بکەری لێکدراو). کە بەلایەوە لە فرمانی تێنەپەڕیشدا (ا) کەی دەمێنێتەوە وەك ((خێرا سووتاو)). ئەمە جێی سەرنجە چونکە دەنگی (ا) لە هەندێ فرمانی تێپەڕدا وەکو (ا)ی فرمانی رووداو چۆن لە رانەبردوودا دەبێتە (ی) لە مانیشدا دەمێنێتەوە و لە رانەبردوودا دەبێتە (ە)، وەك چۆن (ا)ی چاوگی (دان، نان) لە رابردوودا دەبێتە (دا، نا) و رانەبردۆکەشیان (دەبەم- دەنێم). بەمە پاشگر بوونی (ا)ی فرمانی رووداو بەوەی لە فرمانی تێپەڕ و تێنەپەڕی ئاساییدا دەگۆڕی بە (ە)و لە رێژەی (ناوی بکەری لێکدراو)یش (ە) کە دەمێنێتەوە وەك (ناندەر، نامەنێر)، بەمەدا بۆچوونی دانەر بە پاشگر بوونی (ا) لە فرمانی رووداندا هەڵدەوەشێتەوە، چونکە لە فرمانی ئاساییشدا بە دەردەکەوێت و دەمێنێتەوە.

(44) مەسعوود محەممەد، چەند حەشارگەیێکی رێزمانی کوردی، بەغدا، 1976.

پاشان (هەڵکەوت، هەڵکەوتوو) لە لاپەڕە (20)دا بە لێکدراو دەزانێت کە خۆی دارِژاوە. هەر لە بارەی ڕێژەیەکی تری (ناوی بکەری لێکدراو)ەوە دەڵێ: ((... ئەوەندەی بەدوای نمووناندا گەڕابێتم تەنها (3) فعلم دیوەتەوە صیغەی اسم فاعل مرکبیان لەلاوە دەنگی (ر)ی بۆ هاتبێت ئەوانیش فعلەکانی (دان- نان- خستن)ن کە اسم فاعلەکەیان دەبێتە (نان دەر- لێنەر- یەك خەر) (ل 46).

مامۆستا مەسعوود کە دەڵێ، دەنگی (ر) لەلاوە هاتۆتە ناو ئەو وشانەوە تووشی هەڵەی گەورە بووە راستییەکەی بوونی (ر) لەوێدا بریتییە لە کورت کراوەی نیشانەی (ەر)، پاش ئەوەی چۆتە سەر ڕەگەکانی ئەو سێ چاوگەی بریتین لە (دە، نێ، خە) وەك ئاشکرایە بەپێی دەستووری زمانی کوردی دوو بزوێن پێکەوە نایەن. جا لە یەکەمیاندا (ە)ێکیان تێچووە، لە دووەمیاندا (ێ)ی ڕەگەکە نەماوە و لە سێیەمدا دیسان دەنگێکی (ە)کەیان تێچۆتەوە و (ر)ی نیشانەی (ەر)ی (ناوی بکەر)ی ماوەتەوە. واتە بەم جۆرە:

| چاوگ | ڕەگ | نیشانەی (ەر) | ناوی بکەر |
|---|---|---|---|
| نان دان | نان دە | ەر | ناندەر |
| لێنان | لێنێ | ەر | لێنەر(45) |
| یەك خستن | یەك خە | ەر | یەك خەر |

ئەم ناوە بکەریانەی سەرەوە بە تێچوونی بزوێنی (ە) لە یەکەم و سێیەمیاندا و بزوێنی (ێ) لە دووەمیاندا دروست بوونە.

بەم جۆرە دەرکەوت کە (ر) لە نیشانەی (ەر)ی (ناوی بکەر)ی ماوەتەوە و لاوەکی و لابەلایی نەهاتۆتە ناو (ناندەر، لێنەر، یەکخەر)(46).

---

(45) لێنان: بەم شێوەیەش ناوی بکەری لێوە دادەڕێژرێت: لێنێ + ەر= بە تێچوونی (ە) (لێنێر) ماوەتەوە.

(46) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پەراوێزی (36).

ماموٚستا گیوی موكریانی له كتێبی ((ئەلف و بێی كوردی وێنەدار بە تیپی لاتینی[47]))دا لە ناوی بکەر و ناوی بەرکار کە خۆی ناوی ناوە ((بكەر، ئاوەڵناوی کراو)) زۆر بە کورتی لە بارەیانەوە دواوە. بەم شێوەیەی خوارەوە سەرنج و تێڕوانینم لە بارەی باسی ناوی بکەر و ناوی بەرکاری سەرچاوەی ناوبراوەوە دەخەمەڕوو:

1- لەگەڵ کورتی دوانیدا لە بارەی (ناوی بکەر)ەوە کە تەنها لە لاپەڕە (139)دایە بە گشتی شێوەی جیاوازی دروستبوونیانی خستۆتەڕوو و ئەوەی ڕاگەیاندووە کە لە چاوگی تێپەڕ و تێنەپەڕ پێکدێن... بەڵام لەناو نموونەکانیدا نموونەی وا هەیە، وەکو ((بەختیار، هۆشیار... هتد)) لە ناوەوە دروستبوون و باسینەکردووە.

2- لە ڕووی ناونانی بابەتەکەوە بە ((بکەر)) و ((کرۆکناڤ)) کە بکەر و ناوی بکەر دەگرنەوە، یەکەمیان دروستنییە و بەگشتی هەموو بکەرێك دەگرێتەوە، نەك تەنیا ناوی بکەر. دووەمیان راستە کە تایبەتە بە ((ناوی بکەر))ەوە.

3- لە ڕووی پێکهاتنەوە ((ناوی بکەر))ی بە سادە و لێکدراو داناوە و ناوی داڕژاوی هەر نەبردووە و داڕژاو و لێکدراویشی بە لێکدراو زانیوە. ئەمە لەگەڵ هەڵکەوتی زمانی کوردیدا ناگونجێ، چونکە (ناوی بکەر) کە لە چاوگەوە وەردەگیرێ شێوەی سادەی نییە.

4- تێکەڵ کردنی پێشگر و ڕەگی فرمان و ناو و نیشانەی (ەر) لەژێر ناوی ئامرازدا. بێگومان ئەمە راست نییە. وێڕای ئەوە پاشگری (ا)ی بە (ان) داناوە.

لە لاپەڕە (140)دا تەنها بەدوو دێڕ لە بارەی (ناوی بەرکار)ەوە دواوە. بە پێناسەیەکی ناتەواویەك شێوەی دروستبوونی کە بەهۆی (راو)ەیە، کۆتایی بەو باسە گرنگە هێناوە. وەك چەند جارێك لێی دوام، ئەو پاشگرە (راو) نییە و (و)ە.

(47) گیوی موکریانی، ئەلف و بێی کوردی وێنەدار بە تیپی لاتینی، بە زاراوەکانی سۆرانی، بادینی، فەیلی، هەورامی، چاپخانەی، کوردستان هەولێر، 1972.

پاش ئەمە رووداوەکەینە کتێبی (زمان و ئەدەبی یەکگرتووی کوردی) دکتۆر جەمال نەبەز و[48] دەربڕینی سەرنجەکانم. لە (ل31-32)دا زۆر بە کورتی لە (ناوی بکەر) و (ناوی بەرکار) دواوە. بەڵێ راستی بۆچووە کە ناوی بکەر لە کرمانجی خوارووودا لە چەند رێگەیەکەوە پێك دێت، کەچی خۆی تەنها باسی یەك شێوەیانی کردووە کە لەگەڵ کرمانجی ژوورووودا لە یەکەوە نزیکن. بەڵام ئەو شێوەیەی نووسەر باسی کردووە کە بەلادانی (ن)ی چاوگ و پێوەلکانی پاشگری (وو)، (یو)ەوە رووودەنرێن هەڵەیە. چونکە وەك ئاشکرایە، هەردوو پاشگرەکە (ئەگەر چی دووەمیان بەو جۆرەی ئەو دایناوە پاشگر نییە) هەریەکن، کە ئەویش پاشگری (و-w)ە بەهۆی تایبەتی فۆنەتیکی کوردی و گۆڕانی دەنگەوە دەبێ بەواوی درێژی (وو-ū) ئەگەر قەدی چاوگەکان بە (ت، د) کۆتاییان هاتبێت وەکو: گەیشتوو، هاتوو. ئەگەر قەدەکانیش بە بزوێنی (ا،ی) کۆتاییان هاتبێ ئەوا (ناوی بکەری داڕژاو) بەهۆی (و)ەوە پێکدێت وەکو: گریاو، فڕیو. ئەگەر (واو)یش بێت وەکو خۆی دەمێنێتەوە.

نووسەر بە هەمان شێوەی نووسەرانی پێشوو لە وەرگرتنی (ناوی بکەری داڕژاو)دا لە قەدی چاوگی تێنەپەڕ بە هەردوو جۆرەکەی (گوێزانەوە و رووودان)ەوە بە یارمەتی پاشگری (وو، یو) تێکەڵکردووە. وەکو چەند جارێك لەمەو پێشەوە روونمانکردەوە ئەو دوو جۆرەی چاوگی تێنەپەڕ (ناوی بکەر) و (ناوی بەرکار)ی لێوە وەردەگیرێت. پاشان (یو) پاشگری ناوی بکەر نییە وەکو مامۆستا لە لاپەڕە (31) لە نموونەکانی (فڕیو، دزیو) نیشانیداوە. بەڵکو وەکو لەسەرەوە خستمانەڕوو ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە، راستیەکەی پاشگرە، کە هەر (و)ە دەنگی (ی) بنەڕەتییە و هی قەدی چاوگە یائیێکانە و راستیەکەی بەم جۆرەیە: فڕین: فڕی+و ـــــ فڕیو، دزین: دزی+و ـــــ دزیو.

لە هەمان لاپەڕەدا هاتۆتە سەر باسی (ناوی بەرکار) و هێمای بۆ ئەوە کردووە کە لە ڕەگی تێپەڕ و بە تێپەڕ کراو و پاشگری (راو، ێنراو) دروستدەکرێت وەکو

---

(48) جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، بامبێرگ، 1976.

نموونەکانی (خوراو، کراو، سوتێنراو، مرێنراو) (ل31). ڕاست نییە (راو، ێنراو) بە پاشگری (ناوی بەرکار) دابنرێت، چونکە هەروەکو چەند جارێك روونمان کردۆتەوە ئەو شێوە پاشگرە بریتییە لە تێکەڵکردنی نیشانەی فرمانی نادیاری و پاشگری (و)ی ناوی بکەر و ناوی بەرکاری لەقەدی چاوگی تێنەپەڕ. هەروەها دەنگی (ی)یە بنجییە و هی ڕەگی چاوگە تێنەپەڕە بە تێپەڕکراوەکانی وەك (سوتاندن)ە لە وەرگرتنی ڕەگەکانیاندا، وەك (سوتێن) دەنگی (ا)ی گۆڕاوە بە (ی) و هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر بە بەشێك لە (را+و) دابنرێ. نووسەر هەمان هەڵەشی لە (ناوی بکەر)دا کردبوو، کە (یو)ی، بە پاشگری ناوی بکەر لە (فڕیو) دانابوو کە خۆی بە تەنها (و)ە.

لە لاپەڕە (49)دا جارێکی تر (ناوی بەرکار)ی لەژێر ناونیشانی ((دۆخی بەرکاری Participle (حاله المفعول)))دا لە هەردوو شێوەی کرمانجی سەروو و خوارووداا باسکردووە بەڵام باسەکەی ئێمە تەنها شێوە زمانی وێژەیی — واتە (اللغه الادبیه)- دەگرێتە خۆی کە کرمانجی خوارووە.

نووسەر لە هەمان لاپەڕەدا جارێکی تر ناوی بکەر و ناوی بەرکاری کە لە قەدی تێنەپەڕی گوێزانەوە و ڕوودان و قەدی نادیارەوە بە هەڵە تێکەڵکردووە وەکو (هاتوو، کەوتوو، مردوو، زاو، ماو، بەزیو، گریاو، ڕەویو) کە (هاتوو، کەوتوو، زاو، ماو، گریاو، ڕەویو) ناوی بکەری داڕژاون و (مردوو)ش ناوی بەرکارە و (گوتراو، کوژراو)یش ڕێژەیەکی تری ناوی بەرکارە کەچی دکتۆر نەبەز هەرسێکیانی بە (ناوی بەرکار) داناوە.

لێرەوە ڕوو دەکەمە سەرچاوەیەکی تر بۆ دەربڕینی سەرنجەکانم لە بارەیەوە ئەوەندەی پەیوەندی بە بابەتەکەی منەوە هەبێت ئەویش ((ڕێزمانی کوردی)) ئەحمەد حەسەن ئەحمەدە[49] ئەمیش وەکو نووری عەلی ئەمین و جگەرخوێن لە

---

(49) ئەحمەد حەسەن ئەحمەد، ڕێزمانی کوردی، بەغدا، 1976.

دابەشکردنی بەشەکانی ئاخاوتندا بەسەر ((نـاو، فرمـان، پیـت))[50] شـوێن پێـی زمانەوانانی عارەبی هەڵگرتووە.

لەم کتێبەیدا ئەوەی جێگای مەبەستی ئێمە بێت تیشکی تێڕوانینمانی بخەینـە سەر ئەو وشانە کە لە چاوگەوە دادەڕێژرێن و لە سەرەتاوە رووننمانکردۆتەوە.

نووسەر وەکو باسێکی سەربەخۆ لەو بارەیەوە لای لە چاوگ نەکردۆتـەوە. ئـەوە نەبێت کاتێ لە باسی ((ئاوەڵناو))دا کە ئاوەڵناوی بەسەر ((سادە، لێکدراو کۆژ یان رستە)) (بڕوانە: ل129)دا دابەشکردووە، لە ناوی بکەر و ناوی بەرکار دواوە. ئـەم دابەشکردنە تەواو نییە. راستێکەی ئاوەڵناو سادە و دارِژاو و لێکدراوی هەیە... لە خاڵی ژمارە (5)ی لاپەڕە (136)دا دەڵێ ((هەندێ ئاوەڵناو هەن کە لـە ناوێـك و (پیتێکی لکاو) پێکهاتوون، ئەمانەش هەر بە سادە دەژمێررێن. ئەو پیتە لکاوانە- لە دواوە- ئامراز نین و ئەرکەکەیان گشتی نییە: ... خەمبار، گوناهبار، کۆتربـاز، فێڵباز، چەنە بـاز، گرینـۆك... خوێنـدەوار...)) لێـرەدا چـەند هەڵەیـەکی گـەورە روویداوە و ئێستا یەکەیەکە روونیان دەکەینەوە:

1- پێش هەموو شتێك ناوبردنی ئەو وشانەی سەرەوە لەژێر باسی ئاوەڵنـاودا وەکو بابەتێکی سەربەخۆ هەڵەیە، چونکە بابەتی تایبەتین و لەمە و پێشەوە روونمان کردەوە، کە ئەم وشانە ئاوەڵناوی بکەری لێکدراون. تـەنها (گرینـۆك، خوێنـدەوار) نەبێت ئاوەڵناوی بکەری دارِژاون. لە بەکارهێناندا دەبنە ناویش و ئاوەڵناویش. لـە دارِشتنیاندا فرمان دەورێکی چالاکی هەیە و پێویستە سەربەخۆ لێکۆڵینەوە و باسی لێوە بکرێت.

2- ئەو وشانەی سەرەوە راست نییە بە سادە ناوبرێن، چونکە هەنـدێکیان لـە وشەیەکی واتادار و ڕەگی فرمانی (بار، باز) پێکهـاتوون. یەکـەمیان (بـار) ڕەگـی چاوگی (بارین)ە و دووەمیان (باز) ڕەگی چاوگی (بازیدەن)ی فارسییە.

---

(50) هەمان سەرچاوە، ل 87.

جا بەهیچ جۆرێك پیت نین، چونكە ڕواڵەت و مەبەستی وشەكانیان گۆڕیوە[51]. هەندەكی تریشیان كە بریتین لە (نۆك، ەوەر، ەوار) هەر پیت نین و پاشگرن و ڕەگ و فرمانی (گریان، خوێندن)یان كـردووە بـە ئاوەڵنـاوی بكـەری داڕژاو. نووسـەر لـە بنەڕەتدا ناوی بەشی داڕژاوی نەهێناوە و لەگەڵ سادە و لێكدراودا تێكەڵی كـردووە و ئەمە تێكەڵكردنێكی نابەجێیە.

لە پاشاندا دەڵێین ئەو ((پیتە لكاوانە)) ئەركەكانیان گشتین، چونكە دەچنە سەر ڕەگی فرمان و ناوی سادە و ئاوەڵناوی داڕژاو دروستدەكەن، وەك (ریخ، پرچ، قیڕ) و دەبنە (ریخنۆك، پرچنۆك، قیڕنۆك).

نووسەر نموونـەكانی نـاوی بكـەر و نـاوی بـەركاری پێكـەوە دانـاوە و بـەهیچ جۆرێكیش جیاوازی لـە نێـوان ئـەو وشـانەدا نـەكردووە كـە لـە چـاوگی تێپـەڕ و تێنەپەڕەوە وەرگیراون تەنانەت ئەوەندەشی نەوتووە كە ئەو جۆرە وشانە لە چاوگەوە وەردەگیرێن. سەرەڕای هەموو ئـەوەش، نووسـەر گـشت نـاوێكی بكـەر و نـاوێكی بەركار و خاوەن پیشەش بە ئاوەڵناو دانـاوە و وا بـە پێویـست دەزانـێ، مامەڵـەی ئاوەڵناویان لەگەڵدا بكرێت[52]. ئەمە بۆچوونێكی دوور لە زانـستە، لەبەرئـەوەی ئەم كۆمەڵە وشەیە هەروەكو چەند جارێك روونمـان كردۆتـەوە، دوو لایـەنن و وەكـو نـاویش و ئاوەڵنـاویش بـەكاردێن و بـەپێی بـەكارهێنانیان دەور و ئـەركیان دەگۆڕێن[53]. جابۆیە راست نییە هەر بە ئاوەڵناو لەقەڵەمبدرێن.

---

(51) بڕوانە: محەممەد ئەحمەد سەعید، سەرچاوەی پێشوو، ل 41.

(52) بڕوانە: ئەحمەد حەسەن ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل 137.

(53) بڕوانە: لاپەڕە (129-131)ی ڕێزمانی كوردی، نووری عـەلی ئـەمین، 1960. هـەروەها بابەتی ئاوەڵناوی بكەر، ئاوەڵناوی كـراوی زمـان و ئـەدەبی كـوردی پـۆلی پێنجـەمی ئامـادەیی، 1981، ل 33-40.

نووسەر کاتێ لە ئاوەڵناوی لێکدراو دەدوێت، دەڵێ ((لێکدراوی ئەم جۆرە ئاوەڵناوەش وەك: هەڵگر، دانەر، راکێشەر، بەرگدروو پاککەرەوە، هەڵگیراو، داخراو، راکێشراو، رێککراو، سەر براو)) (ل138).

لەم وشانەشدا دارِژاو و لێکدراو تێکەڵکراون، ئەمە جگە لە بەیەکەوە باسکردنی ناوی بکەر و ناوی بەرکار بۆ نموونە (هەڵگر- لە رِەگی چاوگی دارِژاو پێکهاتووە، بۆتە ناوی بکەری دارِژاو. ناوە بکەرەکانی ((دانەر، راکێشەر)) کە لە رِەگی چاوگی دارِژاوی (دانان) کە (دانە) و بە چوونە سەری نیشانەی (ەر)ی بکەری و تێچوونی بزوێنی (ە)یەکیان دروستبووە و (راکێشەر)یش بریتییە لە رِەگی چاوگی (راکێشان) کە (رِاکێش)ە و (ەر)ی بکەری کردوێتی بە (ناوی بکەری دارِژاو)، لە یەك بناغەی واتادار و زیادەیەکی بێ واتا پێکهاتوون.

نووسەر لەوەدا راستە ((بەرگدروو، پاك کەرەوە)) لێکدراون و ناوە بەرکارێکانی ((هەڵگیراو، داخراو، راکێشراو)) کە بریتین لە رِەگی چاوگی دارِژاوی نادیار و پاشگری (و)ی بەرکاری، ((رێککراو، سەربرِاو)) لێکدراون.

لە لاپەرِە (139)دا وای داناوە هەندێك ئاوەڵناوی وەك ((زۆر خۆر، راستگۆ، چەپنووس)) لە دوو ئاوەڵناو، کە دووەمیان ناوی بکەرە پێکهاتوون.

هەروەك چەند جارێك، دەیڵێینەوە، کە ئەمانە ئاوەڵناوی رووتی ئاسایی نین، چونکە فرمانەکانیان وشەکانی پێش خۆیانیان لەگەڵ خۆیاندا راپێچکردووە و جگە لە ئاوەڵناوی لایەنی بکەرییان تێدا ئاشکرا دیارە. تەنیا ((خۆر)) نەبێت کە لە رِەگی (خواردن) و نیشانەی (ەر)ی ناوی بکەری پێکهاتووە، دەنا (راستگۆ ، چەپنووس) لە ئاوەڵناو و رِەگی چاوگ خۆیان دەنوێنن و بەهۆی نیشانەی ناسراوی و نەناسراوێوەش وەك ناوی بکەر بەکار دەهێنرێن.

بەگشتی ئەم بەشەی رێزمانەکەی ئەحمەد حەسەن ئەحمەد پرِە لە هەڵە و ناتەواوی و باس و بابەتی تێکەڵ و پێکەڵ و وانیشاندەدەن نووسەر سەیری

سەرچاوەکانی پێش خۆی نەکردبێت، کە نزیکەی نیو سەدەیێك دەبێت زمانەوانانی کورد بناغەیان بە بتەوی دارِشتووە.

لە گۆڤاری ((پەروەردە و زانست))دا وتاری (ناوی بکەر ((الفاعل)) لە زمانی کوردیدا)ی عەبدوڵلا شاڵی بەرچاو دەکەوێت[54]. کە تێیدا لە پێشەکی وتارەکەیدا بەچەند نموونەیەکی ناوی بکەر و ئەو پاشگرانەی کە لە ئینگلیزیدا ناوی بکەر دروستدەکەن[55] دواوە. (بروانە: ل5). پاشان هاتۆتە سەر لێکۆڵینەوەی (ناوی بکەر) لە زمانی کوردیدا و بەگشتی دوو رێگای پێکهاتنی خستۆتە بەرچاو. یەکەمیان ((نموونەکانی گۆڕانی چاوگ، وەك: تێکردن. بکەرەکەی تێکەر و لێکردن- لێکەر، فێرکردن- فێرکەر...و هتد)) (ل:5). ئەم رێگایەی کە نووسەر بەرچاوی گرتووە راستە (ناوی بکەر) پێکدێنێت. بەڵام روونی نەکردۆتەوە ئەو گۆڕانی چاوگە بە وەرگرتنی رەگی چاوگە تێپەڕەکان، بەلابردنی نیشانەی چاوگ و لکاندنی (ەر) هەروەها لەو پاشگرە و ڕەگی چاوگی بە تێپەڕ کراویش وەردەگیرێت. رێگای دووەمیان وای داناوە ((بەدانانی چەند وشەیەك بەدوای چەند وشەیەکی تردا وەك ئاوەڵناوێکی (صفە) لێ دێت)) (ل 6). نووسەر لێرەدا چەند رێگایەکی بێ روونکردنەوە بەسەر یەکدیدا تێکەڵکردووە کە لەناو نموونەکانیدا (ناو+ناو وەك کرێکار)، قەدی چاوگ+کار وەك خوێندکار)، ناو+ڕەگی فرمان وەك ئاسنگەر، مانگر)، (ناو+پاشگر وەك چایچی... هتد بەدی دەکرێت. ئەم تێکەڵکردن و روون نەکردنەوەی رێگا جۆر بەجۆرەکانی (ناوی بکەر) و باسکردنی هەموو بەمل یەکدا بەکارێکی نەشیاو و نارێك لە وشەسازیدا دەدرێتە قەڵەم.

(54) عەبدوڵلا شاڵی، ناوی بکەر ((الفاعل)) لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری (پەروەردە و زانست)، ژمارە (15)، بەغدا، 1979، ل5-7.

(55) نووسەر بە عەرەبی بۆ ناوی بکەر لە سەروتارەکەیدا لە کەواندا بە هەڵە (الفاعل)ی داناوە کە راستێکەی (اسم الفاعل)ە.

نووسەر لە پەراوێزی لاپەڕە (5)دا بێ ڕوونکردنەوە وای نیشانداوە کە ڕێگای یەکەمی ناوە بکەرێکانی وەك (نووسەر) دەبنە ئاوەڵناو کە لە کاتێکدا هەموو ناوێکی بکەر نەك هەر ئەو ڕێگایە لە بەکارهێناندا دەبنە ناویش و ئاوەڵناویش. دواشت لە پەراوێزی دوا لاپەڕەی وتارەکەیدا وای داناوە زۆر وشەی تر هەن بۆ پێکهێنانی ناوی بکەر بەشداری دەکەن، بەڵام بێ ئەوەی ڕوونیبکاتەوە.

محەمەد ئەحمەد سەعید لە گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)دا وتاری ((چەند سەرنجێکی زمانەوانی دەربارەی کتێبی ڕێزمانی کوردی))ی د. ئاوڕەحمانی حاجی مارف بڵاو کردەوە[56].

وتاری ناوبراو کە هەندێ کەموکوڕی کتێبی ((ناو))ی د. ئەوڕەحمانی نیشان دابوو بەگشتی سەرنجی ڕاست و بەجێن لەبەر پەیوەندی بابەتەکەی بە (ناوی بکەر)ەوە، ئێمەش بیروڕامان لە بارەی هەندێك کەموکوڕێوە کە هەیەتی دەخەینەڕوو:

1- وتار نووس ڕەخنەی گرتووە، لە پێناسەی ناوی داڕژاوی د. ئەوڕەحمان دەڵێ: ((مەرج نییە لە وشەیەکی سادە و زیادییەك دروستبێت)) (ل41). بەڕای ئێمەش مەرجە، چونکە ئەگەر بووە دوو وشە وەك نووسەر خۆیشی وتوویە، دەبێتە لێکدراو. کەواتە ئیتر چۆن داڕژاو و لێکدراو لە یەکتر جیا دەکرێنەوە.

2- بۆچوونی نووسەر ڕاستە بەوەی ئاوەڵناوی بکەری داڕژاو (ناوی بکەر) سیفەتێکی هەمیشەییان هەیە بەڵام دەبوایە ڕوونی بکردایەتەوە، کە ئەو سیفەتەیان بەهۆی بەردەوام بوونی کارەکە و تایبەت بوونیان بە خاوەنی کارەکەیانەوەیە و بەوەش کە لە چاوگ وەرگیراون و بکەرێتیان تێدایە، خاسیەت و سیفەتی هەمیشەییان هەیە. بەڵام هەڵەیەکی تری لەوەدایە ئەگەرچی بەڕاستی (کەر)ی ڕوون کردۆتەوە کە پاشگر نییە و بریتییە لە ڕەگی چاوگی (کردن) و

---

(56) محەممەد ئەحمەد سەعید، چەند سەرنجێکی زمانەوانی دەربارەی کتێبی ڕێزمانی کوردی، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە، 93ی ساڵی 1982، ل 40-44.

نیشانەی (ەر)، (باز)یشی بە ڕەگ و بەناویش زانیوە، بەڵام (ساز)ی فەرامۆش کردووە کە دکتۆر ئەورەحمان بە پاشگری داوەتە قەڵەم. لەڕاستیدا (ساز) ڕەگی چاوگی (سازان)[57]ە و گەردانیش دەکرێ، وەك (سازام، سازایت، بسازە، بۆ تێپەڕیشی (سازاندن)ە. ناوە بکەرە داڕێژراوەکەی (سازێنەر)ە.

3- ((چێشت لێنان))، کە ((چێشت لێ نەر))ی[58] لێوە وەرگیراوە و کە (ناوی بکەری لێکدراو)ە، چاوگی لێکدراوە، نەك داڕژاو. هەروەها لە خاڵی (9)یەمی لاپەڕە (43)دا دەڵێ: ((تەنە شۆر)) ناو و ڕەگی کرداری ((شۆردن)) یا ((شۆرین))ە. ئەمە هەڵەیە، ((تەنەشۆر)) بێجگە لەوەی کە (ناوی ئامێر)ە لە ڕەگی چاوگی ((شۆردن)) یا ((شۆرین))ە، نەك کردار، چونکە (شۆردن یا شۆرین) چاوگن نەك فرمان.

بێجگە لە د, ئەورەحمان زمانەوانی تریش هەن کە (ناوی بکەری داڕێژراو یا ئاوەڵناوی بکەری داڕژاو) یان وەك (ناوی داڕژاو) باسکردووە[59]، کەچی نووسەر لە وتارەکەیدا ئەوەی یادداشت نەکردووە.

هەروەها لە لاپەڕە (42)ی وتارەکەیدا ((کوشتار)) کە (ناوی چاوگ)ە هەروەکو دکتۆر ئەورەحمان بە (ناوی داڕژاو)ی ناو بردۆتەوە. لەبەر ئەوەی ئەم وتارەی سەرەوە وەکو هەڵسەنگاندنێك ئاراستەی کتێبی (ڕێزمانی کوردی بەشی – ناو-)ی دکتۆر ئەورەحمان کراوە و پەیوەندی بابەتە رەخنە لێ گیراوەکەی بە بابەتی سەرچاوەی ترەوە نزیکە و بابەتەکانی ئێمەش بە ناڕاستەوخۆیی دەگرنەوە، وا لە خوارەوەدا سەرنجمان لە بارەیانەوە دەردەبڕین.

---

(57) بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە (228)ی ((زاری زمانی کوردی))ی محەممەد ئەمین هەورامانی دەربارەی، بەڕەگ بوونی (ساز).

(58) محەمەد ئەحمەد سەعید، سەرچاوەی پێشوو، ل 42.

(59) بڕوانە: محەمەد ئەمین هەورامانی، سەرەتایەك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی، بەغدا، 1973، ل.

محەممەد ئەمین هەورامانی لە کتێبی ((سەرەتاییێك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی))دا[60] لەژێر سەرباسی ((پاشبەند))دا وشەی (خشۆك)ی بەناوی داڕژاو داناوە، کە خۆی (ناوی بکەری داڕژاو)ەو بۆتە (ناوی شوێن)یش. هەروەها (سووتوو) لە لاپەڕە (119)دا ناوی ئاسایی نییە، بەڵکو (ناوی بەرکاری داڕژاو)ە. ئەمە بێجگە لە نموونەکانی ژمارە (17)ی لاپەڕە (119، 121، 122، 123)، کە لە خاڵەکانی (و، ص، ش، ت، پ)دا بەناوی لێکدراوی ئاسایی داینـاون. راستێکەی (ناوی بکەری لێکدراو)ن و بەشی دووەمی وشەکانیش وەکو (کەر، کەن، ژەن، ساز، دۆز) هەموویان ڕەگی چاوگن و وەکو ئەو دەڵێ ((باشپەندنین، چونکە لە وشەسازیدا ڕەگی چاوگ وەکو چەند جارێك لە سەرەتاوە رامان گەیاند، دەچنە ریزی وشەوە. نووسەر بێجگە لە (را- درا، رێ- درێ)، (راو- دراو)دا، کە پێکهاتوون لە دوو نیشانەی (را- درا)ی فرمانی نادیاری و پاشگری (و)ی ناوی بەرکاری کە ئەو بۆ دەستنیشانکردنی فرمان و لەژێر خانەی فرماندا ((کێڵراو))ی داناوە، ناوی بەرکارییە. (بێ پۆش)، (سەرباز) لە (ل120، 122)دا کە (ناوی ئامێر) و (ناوی بکەر)ن بە هەمان شێوەی ئەوانی تر بە (ناوی ئاسایی) یان دەزانێت و (پۆش) کە ڕەگی چاوگی (پۆشین)ە و (باز)یش ڕەگی (بازیدەن)ە پێوانەی (ناو)ی بۆیان کردووە. لەڕووی واتاوە هەمان هەڵەی لە فەرامۆش کردنی جۆری ناوەکانی خاڵی (ب)ی (ل153)دا کردووە واتە (ناوی چاوگ)ی بەناوی ئاسایی لەقەڵەمداوە.

لێرەوە رووەدەکەینە کتێبێکی تری نووسەر کە ((زاری زمانی کوردی))یە[61] لە ساڵی 1981دا بلاوکراوەتەوە. هەروەکو سەرچاوەکانی تر دەڕوانینە بابەتی جێ مەبەستمان کە وشە وەرگرتنە لە چاوگەوە. نووسەر لە لاپەڕە (206)دا دەڵێ فرمانی نادیار لە چاوگی وەکو (کوژراو، بڕراو، دزراو، گیراو، شێلراو)ەوە وەردەگیرێ

---

(60) محەممەد ئەمین هەورامانی، فیلۆلۆژی زمانی کوردی، بەغدا، 1973.

(61) محەممەد ئەمین هەورامانی، زاری زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردا، دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، 1981.

ئەمانە (ناوی بەرکاری دارِژاو)ن نەك چاوگ. لە رەخنەکەیدا کـە لـە د. ئـەورِەحمان گرتوێتی، بەوەی (کەر)ی بە پاشگر داناوە، راستە چونکە (کە) پاشگر نییە. بـەڵام بە تەنها رِەگیش نییە وەکو ئەو بۆی چووە، بەڵکو بریتییە لە رِەگی کردن و پاشـگر (ەر)ی ناوی بکەری (کە+ەر). هەروەها بەلایەوە (ئاسنگەر)ی دوکتۆر هەڵەیە، کـە لە (ئاسن+پاشگری گەر) پێکهاتبێ. بەلای هەورامانییەوە (ئاسنگەر) بووە، بەهۆی گۆرِانی دەنگسازییەوە بۆتە (ئاسنگەر)، چونکە (ن)ی ئاوازە دار کاری لـە دەنگـی (ك) کردووە. ئەم رایەی رەت دەکرێتەوە بـەوەی وشـەکە لـە بنەرِەتـدا لـە (ئاسـن گـرتن)ەوە هـاتووە رِەگـی چـاوگی لێکـدراوە و (نـاوی بکـەری لێکـدراو)ی لێـوە پێکهـاتووە. بەڵگـەشمان شـێوەزاری هەنـدێ ناوچـەی کرمـانجی خـواروە، دەڵـێن (ئاسـنگر). بەڵگـەشمان رِای مەسـعوود محەمەدیـشە لـە لاپـەرِە (245)ی ژمـارە (111)ی رۆشنبیری نوێ 1986. لەلاپەرِە (225، 245)دا (کوشندە)ی بەناو و بە ئاوەڵناو داناوە، (کوش)یش بەناو. راستە (کوشندە) دەبێتـە نـاو و ئاوەڵنـاویش بەڵام نەك بەشێوەی ئاساییان، چونکە (ناوی بکەری دارِژاو)ە و بـەپێی بـەکارهێنان دەگۆرِێن و بابەتێکی سەربەخۆیە، (کوش- کوژ) رِەگـی فرمـانی (کوشـتن)ە، نـەك (ناو). (بەرکوت) لە پەراوێزی (ل 234)دا لـە (نـاو+رِەگ)ە. پاشـگری (ەك) کـە دکتۆر ئەورِەحمان بەو شێوەیە پاشگری زانیوە بەلای هەورامانییەوە بریتییە لـە دوو مۆرفێمی (ە + ك). لەراستیدا (ە ك) تەواترە و یـەك مۆرفێمـە، چـونکە (کوتـە) (ە)کەی بۆ مەبەستی (ناوی چاوگی)یە و جیاوازە لە (ە)ی (ەك) کە (نـاوی ئـامێر) پێکدەهێنێت لە لاپەرِە (243، 245، 251،247)دا پاشـگرەکانی وەك (یـار، اك، ند، ا) پاشگری ناوی نین بە تەنها، بەڵکو دەلکێن بەرِەگی چاوگیشەوە و (ناوی بکەری دارِژاو، ناوی ئامێر) پێکدەهێنن. لە بەکارهێناندا نـاوە بکـەرێکان دەبنـە ئاوەڵناویش نەك ناو و ئاوەڵناوی ئاسایی کە نووسەر جارێك بـە نـاو و جارێـك بـە ئاوەڵناو لێوەیان دواوە. بە هەمان شێوە (نـەزان، نـەترس) ئاوەڵنـاو نـین، بـەڵکو ئاوەڵناوی بکەری دارِژاون ئەو (نە)یە وەکو پێشگر ئەگەر بچێتە سەر رِەگی فرمـان

لە ڕێژەی (ناوی بکەر)دا نیشانەی ناوی بکەر بەڕەگەکانیانەوە نامێنێت وەکو (ب، ەر).

مامۆستا هەورامانی (پەشتەماڵ) کە (ناوی ئامێری لێکدراو)ە لە لاپەڕە (255)دا بە ناوی لێکدراوی داناوە. لە هەمان لاپەڕەدا بە ئاوەڵناوی ئاسایی زانیوە. کە لە راستیدا (ناوی بەرکاری داڕژاو)ە.

د. ئەورەحمانی حاجی مارف لە کتێبی ((وشە رۆنان لە زمانی کوردیدا))[62] لە ل(50، 51)دا و د. نەسرین فەخری و د. کوردستان موکریانی لە لاپەڕە (11)ی کتێبی ((ڕێزمانی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی بەشی زمانی کوردی زانکۆی سەلاحەددین))[63]دا بەشێوەی محەممەد ئەمین هەورامانی ((کەر، ساز، باز، گەر)) یان بە ناڕاستی بە پاشگری داناوە. وەك پێشتر لێیان دواین (ڕەگی چاوگ)ن و (کەر)یش بریتییە لە ڕەگی چاوگی (کردن) و نیشانەی (ە ر)ی ناوی بکەری و (ە)یەکیان تێچووە، چونکە دوو بزوێن لە کوردیدا ناچنە سەریەکتر. هەروەها ئەو وشانەشی کە لەگەڵ ناوێکی واتاداردا دروستیدەکەن بریتین لە (ناوی بکەری لێکدراو) نەك وەك نووسەرانی ناوبراو بە ناڕاستی بە ناوی ئاسایی داڕژاو زانیویانە. چونکە ئەم وشانە ناوی ئاسایی نین و لە چاوگەوە وەردەگیرین و بابەتێکی سەربەخۆن ناشێت بەو شێوەیە لێیانەوە بکۆڵرێتەوە. نموونەشمان ((ئاسنگەر، دانساز، سەرباز، نانکەر، سواڵکەر))ە کە دیارن ناوی داڕژاوی ئاسایی نین و ناوی پیشە و کارن بۆ خاوەنەکانیان بوونەتە سیفەت و خاسیەتێکی بەردەوام و ئەگەر بوونە تەواوکەری ناو یا ڕاناو ئەوا دەبنە ئاوەڵناوی بکەر. بە کورتی د. ئەورەحمان نموونەکانی لاپەڕە (50، 51، 61 تا 64، 69، 71، 72)ی کتێبی ((ڕێزمانی کوردی)ی،

---

(62) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشە رۆنان لە زمانی کوردیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1977.

(63) د. نەسرین فەخری و د. کوردستان موکریانی، ڕێزمانی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی بەشی زمانی کوردی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، 1982.

هەروەها نموونەکانی لاپەڕە (11 تا 14، 30 تا 32، 35 تا 37)ی کتێبی ((ڕێزمانی کوردی)) د. نەسرین و د. کوردستان کە لە ژێر سەرباسی ناوی داڕژاودا لێکۆڵینەوەکانیان ئەنجامداوە. ڕاستێکەی ناوی داڕژاوی ئاسایی نین بەڵکو بریتین لە (ناوی بکەر بە داڕژاو و لێکدراو، ناوی بەرکار، ناوی چاوگ، ناوی جێگا، ناوی ئامێر) و بابەتی سەربەخۆن و لە چاوگەوە وەردەگیرێن و ناشێت وەکو ناوی ئاسایی باس بکرێن. پێویستە ئەوە بخەینەڕوو کە د. ئەوڕەحمان بێجگە لە سەرکەوتوویی کتێبەکەی (ناو)ی کارێکی هەرە چاکیشی کردووە، بەوەی لە ل (168، 169، 171)دا ناوی لەڕووی توخم (جنس)ەوە دابەشکردوە. ئەو ناوانەی کە پیشە و کار دەگەیەنن و جێگای مەبەستی ئێمەیە لەم باسەدا بەپێی (جنس)ەکانیان دابەشیانیکردووە، وەکو پیشە و کاری پیاوانە، پیشەو کاری ژنانە، پیشە و کاری دوو لایەن. ئەم دابەشکردنە خۆی لە خۆیدا پێڕەوێکی لێکۆڵینەوەی زانستانە و ڕێکوپێکە. یەکەم کەسێکە لەنێو زمانەوانانی کورددا ئەو دابەشکردنەی هێنابێتە ئەنجام. تەنانەت قەناتی کوردۆش لە لاپەڕە (72)ی کتێبی ((ڕێزمانی کوردی))دا وەرگێرانی د. کوردستان بە یەك خاڵ بە ناوی (پیشەوەری)ێوە دواوە. بێ ئەوەی بۆ هەر جۆرێکی ناو لەڕووی (توخم)ەوە نموونە و باس نیشانبدات. دواشت د. ئەوڕەحمان (ڕێژەن) کە (ناوی جێگای داڕژاو)ە بەناوی داڕژاوی ئاسایی داوەتە قەڵەم و لە چاوگی (ڕژان)ەوە وەری گرتووە، کە ڕاستێکەی لە چاوگی (ڕێشتن — ڕشتن)ەوە وەردەگیرێت و (ڕژان) ڕەگەکەی (ڕژێ)یە نەك (ڕێژ) (بڕوانە ل 130 کتێبی ناو).

دوا بەدوای ئەم سەرچاوانەی سەرەوە باری سەرنجەکانم لە بارەی کتێبی (کورتەیەك لە ڕێزمانی کوردی))ی ساڵەح حوسێن پشدەرییەوە دەبێ[64]. لەم کتێبەدا وەکو سەرچاوەکانی تر، ڕوودەکەینە جێ بابەتەکەی مەبەستمان. نووسەر لە ژێر سەرباسی ((سوودی قەد و ڕەگی چاوگ))دا ئاوڕی لەو وشانەی وەك (ئاوەڵکەر- الصفه المشبهه) و (ئاوەڵکارا- اسم الفاعل)، ئاوەڵکراو- اسم لمفعول) داوەتەوە و

---

(64) ساڵەح حوسێن پشدەری، کورتەیەك لە ڕێزمانی کوردی، بەغدا، 1985.

دەڵێ: ((ئاوەڵکەر لە قەد و ڕەگی تێپەڕ و تێنەپەڕ ساز دەبێ بە یاریدەی نیشانەی (او، و، یو). )) (ل49). لە ڕاستیدا (ئاوەڵکەر- الصفه المشبهه) لە ڕێزمانی کوردیدا وەکو بابەتێکی ڕێزمانی نییە و ڕەت دەکرێتەوە. بەڵکو بابەتێکی ڕێزمانی عەرەبییە کە تایبەتە بەو زمانەوە[65] ئەو ڕێژەیەی (صیغه) کە بەنیشانەی (او، و، یو) پێکدێت لە قەدی چاوگەوە وەك نووسەر بۆ چووە، ڕاستیێکەی بریتییە لە (ناوی بکەری دارِژاو) کە لە قەدی چاوگی تێنەپەڕی گوێزانەوە (انتقالی)وە بە یاریدەی پاشگری (و)ەوە وەرگیراوە وەك ((کەوتوو، گەیشتوو، مار، وەستاو... هتد)) و دوو ڕێژەی (ناوی بەرکاری دارِژاو) کە لە قەدی چاوگی ڕوودانی تێنەپەڕ و پاشگری (و) پێکدێت وەك ((خوساو، رزیو، مردوو)) هەروەها دووەمیان لە قەدی چاوگی تێپەڕ و پاشگری (و، وو)ەوە دروستدەبێت وەك ((خواردوو، شکاو، کێلاو)). نووسەر ئەم سێ ڕێژەیەی سەرەوەی بە ناڕاستی تێکەڵکردووە. پاشان پاشگری (ناوی بکەر و ناوی بەرکار)ی لە قەدی تێنەپەڕ و تێپەڕەوە کە بریتییە لە (و، وو) نەك (او، یو) کە نووسەر بە هەڵە ئەو دەنگی (ا، ی)یەی قەدی چاوگە ئەلفی و یا ئێکانی داوەتە پاڵ پاشگری (و)ی ناوی بکەر و ناوی بەرکاری- لە شوێنی تریشدا لەمەو پێشەوە ئەمەمان روون کردۆتەوە.

بەڕای نووسەر (ناوی بکەر و ناوی بەرکار) تەنها لە تێپەڕەوە وەردەگیرێن. بەهەمان شێوەی پێشووی نیشانەکانی ناوی بکەر و ناوی بەرکاری دروستبوو لە تێپەڕەوە شێواندووە و دەڵێ: ((ئاوەڵکاراو ئاوەڵکراو هەردووکیان لە قەد و ڕەگی تێپەڕ سازدەبن بە یاریدەی نیشانەی )(ەر- ینەر) و (راو- ینراو...)). (ل50). چەند هەڵەیەکی گەورە لەمەدا دەبینرێ و ڕاست کردنەوەیان بەم جۆرەیە:

1- ناوی بکەر و ناوی بەرکار لە تێنەپەڕ و تێپەڕەوەش وەکو لەسەرەوە هەندێکیانم خستەڕوو وەردەگیرێن و ڕێژەی تریشیان هەیە لە ڕەگ و نیشانەی (ە

---

(65) بڕوانە: ا- الدكتور عبدة الراجحى، التطبيق الصرفى، بيروت، 1979، ص (79-80).
ب- محمد التقى الحسنى الجلالى، نزهة الطرف في علم الصرف، النجف الاشرف 1979، ص 64.

ر)ەوە وەك (نووسەر، بینەر) کە ناوی بکەر پێکدەهێنێت و لە قەدی تێپەڕی نادیار و پاشگری (و) دروستدەبێت وەك: کوشتن- کوژران- کوژرا+و= کوژراو، ناسراو.

2- دانانی (ینەر) بە نیشانەی ناوی بکەر هەڵەیە و راستێکەی (ەر)ە، وەك خوێندن ـــ خوێن+ ەر= خوێنەر. دەنگی (ی) بنجییە و تایبەتە بەڕەگی ئەو چاوگانەی یا لە دەنگە سروشتێکانەوە دەکرێن بە تێنەپەڕ یا تێنەپەڕن و بەهۆی پاشگری (اندن)ەوە بوون بە تێپەر، لە ئەنجامی وەرگرتنی ڕەگەکانیاندا دەنگی (ا) دەگۆڕێت بە (ێ) وەك سووتاندن ـــ سووتێنەر. نیشانەی (ناوی بەرکار)یش کە (و)ە و چەند جارێك روونمان کردۆتەوە، دەچێتە سەر قەدی چاوگی نادیاری تێپەڕ وەك: کوژرا+ و ـــ کوژراو کەواتە نە (راو)ە و نە (ینراو)ە دەنگی (ێ) لە (ینرا)دا هەڵەیە و بنجی و تایبەتە بەڕەگی چاوگە بە تێپەڕ کراوەکان بەهۆی (اندن)ەوە لە وەرگرتنی ڕەگەکەیدا (ا) گۆڕاوە بە (ێ) بۆیە هی نیشانەی (را)ی نادیاری نییە. نووسەر راستی بۆچووە کە (نە) و پێشگری (هەڵ، ڕا، دا)ی داڕێژەر شوێنی نیشانەکان دەگرنەوە.

د, قەناتی کوردۆ (کوردۆییێف) لە کتێبی ((ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی))دا لە ڕووی دەنگسازی فۆنەتیکی) و وشەسازی (مۆرفۆلۆژی) و رستەسازی (سینتاکسی)یەوە لە ڕێزمانی کوردی کوڵیوەتەوە[66].

نووسەر ئەگەرچی هەموو شێوەکانی دروستبوونی (ناوی بکەر) و (ناوی بەرکار)ی نەخستووەتە بەرچاو، بەڵام بەگشتی لەڕووی دەنگسازی و داڕشتن و دەوری رستەسازییەوە بەشێوەییەکی ڕێکوپێك لێیانی کۆڵیوەتەوە و پەنجەی بۆ ئەوەش درێژ کردووە، کە ئەو بابەتانەی سەرەوە دەگەڕێنەوە سەر ناو و ئاوەڵناو و ئەرکی ڕێزمانی دەگێڕن. نووسەر بە نموونەوە شێوەی داڕشتنیانی لە هەردوو شێوە (دیالێکت) زمانە سەرەکییەکەی کوردی (کرمانجی و سۆرانی)دا خستۆتە بەرچاو و

(66) ك ك کوردۆییێف، ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی، د. کوردستان موکریانی لە زمانی روسیەوە وەری گێراوەتە سەر زمانی کوردی، هەولێر، 1984.

ئەوەی دەرخستووە کە (ناوی بکەر) لەو دوو شێوەیەدا لـەڕووی دارِشـتنەوە، وەکـو یەکن.

لە بەشی ((ئاوەڵناوی نسبی))ی (ل 108)دا لە وشەکانی (گەڕۆکی، شمتـۆکی، ...)دا پاشـگری (ۆك)ی بـە (ۆکـی) زانیـوە. نموونەکانیـشی کـە (نـاوی واتـایی-ئەبستراکتی)ی دەگرێتەوە بە ئاوەڵنـاوی نـسبی تێگەیـشتووە. بەڵگـەشمان ئەوەیـە (گەڕۆك) (ناوی بکەری دارِژاو)ە وەکو ئاوەڵناوی بکەری دارِژاویش بەکار دەهێنرێت و لە (ڕەگی فرمان و پاشگری (ۆك) پێکهاتووە و لە پاشاندا پاشـگری (ی) واتـایی (ئەبستراکتی) کردوویانێتی بەناوی واتای، نەك بە ئاوەڵناوی نسبی، وەکو: (گەڕ + ۆك= ناوی بکەرە + ی= گەڕۆکی دەبێتە ناوی واتایی نەك ئاوەڵناوی نسبی.

کوردۆییێف وەکو نووسەرانی تر کە لەم باسەدا لێیانەوە دواین ئەو ڕێژەیـەی کـە لە قەدی تێنەپەڕی گوێزانەوە و روودانەوە بـەهۆی پاشـگری (و)ەوە نـاوی بکـەر و ناوی بەرکار پێکدەهێنێت، تێکەڵی کردووە و هەردووکیانی بە (ناوی بکەر) دانـاوە (بڕوانە: ل 215).

د. مەکاریۆس لە کتێبی ((ڕێزمانی کوردی))دا کە سـاڵی 1958 بـە زمـانی ئینگلیزی بلاّوی کردۆتەوە[67]، باسێکی ڕێکوپێکی لەسەر ڕێزمانی کوردی و بەشە ئاخاوتنەکانی کردووە و سەرچاوەیەکی بەکەڵکە بۆ ڕێزمان و زمانی کوردی لەڕووی دەنگـــسازی و (Phonology) وشەســـازی (Morphology) و رستەســـازی (Syntax)یەوە.

د. مەکاریۆس لە لاپـەڕە (59)ی ئـەم کتێبەیـدا لـە (نـاوی بـەرکار- Past Participle) لەڕووی واتاو پێکهاتنەوە دواوە و وای ڕاگەیاندووە کە ئاوەڵناون[68]

(67) Ernest N. Mccarus, Kurdish Grammar, New-York, 1958.

(68) د. مەکاریۆس لە لاپەڕە (49)ی هەمان سەرچاوەدا لەژێر سەرباسـی ئاوەڵنـاودا لـە (نـاوی بەرکار) دواوە. بێگومان نابێت ئەم بابەتە بخرێتە ژێـر بابـەتێکی تـرەوە، چـونکە خـۆی بابـەتێکی سەربەخۆیە و لە چاوگەوە وەردەگیرێت.

و لە قەدی فرمانی رابردووەوە بـەهۆی پاشـگری (وو-و، ū- w) دروسـتدەبن و بـۆ پلەی بەراورد گـەردان نـاکرێن و کاتیـان تێـدا نییـە و ئەگەرچـی لـە چاوگیـشەوە وەردەگیرێن و رابردووی تەواویش لەم رێژەیەوە پێکدێت. پاشان هێما بۆ کردنیان لە قەدی فرمانی دیار و نادیارەوە بەهۆی پاشـگری (و)ەوە کـردووە. هـەروەها ئـەوەی دیاری کردووە کە (ناوی بەرکار) بکەر و بەرکار (Subject, Object) وەرنـاگرن. ئەم بۆچوونانەی نووسەر زۆر راست و لەبارن، بەلاّم بوونی ئەم (ناوی بەرکار)ە بەلای ئەوەوە، تەنها بە ئاوەڵناو (Adjective)، لـە ئاسـتی باسـەکەی کـەم دەکاتـەوە، چونکە وەکو چەند جارێـك لـە زۆر شـوێنی تـری ئـەم لێکۆڵینەوەیـەدا سـەرنجمان بەرامبەر ئەمە خستۆتە پێش چاو، (ناوی بەرکار) بێجگە لە ئاوەڵناو دەبێتە ناویش و دەوری ناویش لە ئاخاوتن و نووسیندا وەردەگرێت و لەو رووەوە بەکارە.

د. مەکاریۆس لە لاپەڕە (60)دا وشەکانی وەکو (هاتوو، دانیشتوو، نوستوو)ی بە (ناوی بەرکار) داناوە. لەراستیدا ئەمانە (ناوی بکەر)ن[69]، چـونکە لـە قـەدی چاوگی گوێزانەوە (انتقالی) وەرگیراون و هەر قەدی چـاوگێکی گوێزانـەوە پاشـگری (و، وو)ی بچێتە سەر دەبێتە (نـاوی بکـەر) و ئەوانـەی لـە قـەدی چـاوگی روودان (مگاوعە)ەوە وەرەگیرێن بەهۆی پاشگری (و، وو)ەوە دەبنە (ناوی بەرکار)، چـونکە بکەرەکـەیان دیـار نییـە و هەنـدێکیانیش بکـەرەکانیان لـە ژوور دەسـەلاّتی مرۆڤەوەن[70] نووسەر ئەو دوو جۆرەی لە سەرەوە روونمان کردەوە، بێ روون کردنەوە بە (ناوی بەرکار) داناوە.

---

(69) نووسەر لە لاپەڕە (84)ی هەمان سەرچاوەدا لـەژێر ناونیـشانی (نـاوی لێکـدراو- Noun Compound)دا ئەو ناوانەی کە لە (ناو + رەگی فرمانی تێپەڕ)ەوە پێکهاتوون، وەکو (رەسم گـر، کاغەزنووس، تاج بەخش کلاّوفرێن، کاڵەك فرۆش، کەر فرۆش) کـە (نـاوی بکـەری لێکـدراو)ن بـە (ناوی لێکدراوی) ئاسایی زانیوە.

(70) بڕوانە: د. وریا عومەر ئەمین، تێنەپەڕ فرمانێکی بکەر نادیارە، گۆڤاری ((رۆشنبیری نوێ))، ژمارە 107، بەغدا، 1985، ل 195-200.

دانـەر لـە لاپـەڕە (87)دا لـەژێر سەرباسـی (پاشـگری نـاوی – Nominal Suffixes)دا لەو پاشگرانە دواوە کە لە ناو و ئاوەڵناو و ڕەگی چاوگەوە ناوی تازە پێکدێنن. ئەمە کارێکی باشـە، [71] بـەڵام دانـانی (بـاز، دان، خانـە) بـە پاشـگر سەرنجی نووسەر رەت دەکاتەوە، چونکە (باز) ڕەگـیش و ناویـشە. هـەروەها (دان، خانە) وشەی واتادارن و یەکەمیان چاوگە. پاشان ئەم نموونانـەی بـۆ نـاوی جێگـای هێناوەتەوە تەنها لە ناو و ئاوەڵنـاوەوەن و لـە چـاوگەوە بـۆ نـاوی شـوێن هیـچی وەرنەگرتووە، کە لە کاتێکدا نموونەی وا لە زمانی کوردیدا زۆرە.

د. مەکەنزی لە کتێبی ((دیالێکتی زمانی کوردی))دا[72] دەربارەی بەشـەکانی ئاخاوتن بە نموونەوە لەڕووی دەنگسازی وشەسـازی و رسـتە سـازێوە بەشـێوەیەکی رێکوپێك بەراوردێکی چاکی دەربارەی زارەکانی زمانی کوردی کردووە.

لەم باسەماندا سەرنجی ئێمە تەنها شێوەی سلێمانی دەگرێتەوە، چونکە پەیوەندە بە زمانی خوێندن و نووسینەوە.

نووسـەر لـە لاپـەڕە[73] (97)ی کتێبەکەیـدا لـە (نـاوی بـەرکار Past Participle) دواوە و دەڵێ: ((ناوی بەرکار لە پاڵ ئەرکە ناوێکەیدا دەبێتـە هـۆی پێکهێنانی تافی تەواو و وەکو ئاوەڵناویش بەکاردێت و لـە قـەدی رابـردووەوە بـە یارمەتی ئەم مورفێمانە (... -w و -ū) پێکدەهێنرێت... وەکو: هاتوو، بوو، باو، گەیو...)) بۆ چوونەکانی نووسەر لێرەدا راستن بەڵام (بوو) نە ناوی بکەر و نە ناوی بەرکارە، نموونەکانی تری کە هێناوەتەوە و لەسەرەوە نیـشانماندان (نـاوی بکـەر)ن،

---

(71) بڕوانە پەراوێزی (6)ی لاپەڕە (236)ی ئەم باسە و هەروەها کتێبی (زاری زمانی کـوردی)، محەممەد ئەمین هەورامانی، بەغدا، 1981، پەراوێزی ل 236.

(72) D. N. Mackenzie, Kurdish Dialect Studies- I

(73) لاپەڕە (84، 177، 187، 190، 215)ی باسـەکەی نووسـەر یـا دووبارەیـە یـا باسـی شێوەزارەکانی ترە، بۆیە ئێمە تەنها لە باسە سـەرەکی و شـێوە زمانـە وێژەییەکـەی ئـەدوێین، کـە شێوەی سلێمانی (کرمانجی خواروو)یە.

نەك (ناوی بەرکار)، چونکە لە چاوگی گوێزانـەوەن. لـە کاتێکـدا دەبوونـە (نـاوی بەرکار) ئەگەر لە چاوگی روودان (مگاوعـە)ەوە یـا لـە چـاوگی تێپـەڕی نادیـار و پاشگری (و) دروستبوونایە، وەکو: برژان ـــــ برژاو، کوژران ـــــ کوژراو. نووسەر لە لاپـەڕە (98)دا راسـتی پێکـاوە کـە وتوویـە (نـاوی بـەرکار) رانـاوی کەسـی وەردەگرێ، چونکە لایەنی ئاوەڵناوییان هەیە و وەکو ئاوەڵناو گەردان دەکرێن.

پاشان نووسەر لە لاپەڕە (142)دا کە لە ژێر بابەتی (لێکدراو) دایە دوو جـۆر لێکدراوی دیاری کردووە. جۆری دووەمیان ((ئەو ناوانەن کە لـە ڕەگـی رانـەبردوو، ڕەگی رابردووی فرمانەوە بەهۆی پێش خستنی بەرکار یا تەواوکەرێك دیاریدەکرێت، وەکو: باوەشێن، بەرگدروو، بزن مژ، دارفرۆش، مۆر هەڵکەن، پیـاوکوژ، سـەرتاش، خوێن رێژ، زۆر زان)). راستە وشەکانی پـێش ڕەگـی چـاوگەکان دەوری بـەرکار یـا تەواوکەریان هەیە، بەڵام ناشێت وەکـو لێکـدراوێکی رووت یـا (نـاوی لێکـدراو)ی ئاسایی باس بکرێن، چونکە ئەم جۆرە وشانە (ناوی بکەری لێکدراو)ن و لە چاوگەوە وەرگیراون و لەمەو پێش ئەمەمان چەند جارێك روونکردۆتەوە. هەرچـی مامۆسـتا مەکەنزییە لەم رووەوە لێیانەوە نەدواوە و تەنها بە (لێکدراو) ناوی بـردوون. ریـزی دووەمی نموونەکان کە لە لاپەڕە (143)دایە و لە قەدی رابردووەوە وەری گرتـووە، وەکو (دەستکرد، دەستکەوت، سـوورەوە کـراو) کـە (نـاوی بـەرکاری لێکـدراو)ن، بەهەمان شێوە لەڕووی واتاوە دەسنیشانی جۆرەکانی نەکردووە. ئەمە بێجگە لەوەی وشەی ((سوورەوە کراو)) لـە ئاوەڵنـاو و بـەرکارێکی دارڕژاو پێکهـاتووە. ئەوەشـی تێکەڵ فرمانە دیارەکانی (کرد، کەوت) کە تێپەڕ و تێنپەڕن کردووە و هێمـانی بـۆ ئەمە نەکردووە.

لـە لاپـەڕە (146، 147، 148)دا لـە ژێـر ناونیـشانی ((پاشـگر – Suffixes))دا[74] بەرێز لەو پاشگرانە دواوە، کە لە دارشتنی (ناوی جێگا، نـاوی

(74) هـەمان باسـی پێکهێنـانی نـاو لـە ژێـر ناونیـشانی ((پاشـگر)) (ل 217- 218)دا بـۆ شێوەزارەکانی دی دووبارە بۆتەوە.

بکەر، ناوی چاوگ)دا بەشداری دەکەن. ئەگەرچی واتــاو مەبەســتی ئــەم پاشــگرانە (گا، کەر، کار، گار، یار، باز، ۆك، ەر، ە)ی روون کردۆتەوە، بەلاّم لــە بارەیانــەوە ئەم سەرنجانەم هەیە:

1- نموونەکانی پاشگری (گا) کە بۆ شوێنە، تەنها لە نــاوەوە وەری گرتــوون و بەلای فرماندا نەچووە (کەر، باز) پاشگرێن و ڕەگی چاوگن و لەمەوبەر چەند جارێك روونم کردۆتەوە و پێویست بە درێژەدانی ناکات. (کار) ناوە، بەلاّم (یار) پاشگریش و ناویشە و وەکو پاشگر واتای (لەگەڵ بوون دەبەخشێت).

2- وای ڕاگەیاندووە کە (ۆك) لە ڕەگی فرمانەوە ئاوەڵناو پێکدەهێنێت، وەکو ((گەڕۆك))، بەلاّم وەك ئاشکرایە نــاویش ئاوەڵنــاویش پێکــدێنێت، بەتایبــەتی لــە چاوگی (گوێزانەوە)دا (ناوی بکەر) دروستدەکات.

نموونەی (پارێزگــار)، کــە لــە ڕەگــی چــاوگی (پاراســتن) و پاشــگری (گــار)ەوە پێکهاتووە، نووسەر وای داناوە کە لەگەڵ پاشگری (یار) لە وشەی (کڕیار)دا نــاو و ئاوەڵناو پێکدەهێنن و واتای بکەرێتی و پیشە دەگەیەنن. بەڵێ ئەمە راستە، بەلاّم پێویست بوو، بیوتایە لە ڕەگی چاوگەوە وەرگیراون و (نــاوی بکــەر) دروســتدەکەن، نەك ناو و ئاوەڵناوی ئاسایی.

## كورتەی هەڵسەنگاندن

لە بەشی یەکەمی ئەم نامەیەدا لە زۆربەی ئەو سەرچاوانەی کە لـە بابەتـەکانی وەك (ناوی بکەر، ناوی بەرکار، ناوی چاوگ، ناوی جێگـا، نـاوی ئـامێر) کـە لـە چـاوگەوە وەردەگیرێن، دواوم و سەرنج و هەڵـسەنگاندنم لـە بارەیانـەوە خـستۆتەڕوو. هـەموو بـە مەبەستی تەواوکردن و نەهێشتنی کەموکوڕی و وەرگرتنی لایەنە چـاکەکانیان، هـەردوو لایەنی چاك و خراپیانم نیشانداوە.

چەند سەرچاوەیەکی کەم نەبێت، کە لەبەر هەندێ هۆ باسیانم نەکردووە.

زمانـەوانانی کـورد لـە باسـکردنی ئـەو بابەتانـەی سـەرەوەدا لـە سەرچـاوە ڕێزمانیەکانیاندا تێکڕا (ناوی بکەر، ناوی بەرکار) یان بەرچاو گرتووە و جۆرەکانی تریان فەرامۆش کردووە یاخود بەدەگمـەن نـەبێت نووسـەرێك نـابینین لـەبارەی هـەموو ئـەم بابەتانەوە دوابێت جگەر خوێن نەبێت[75]. بەلاّم نموونـەکانی وەك (نـاوی ئـامێر، نـاوی جێگا) بە تێکەڵی لە چاوگیش و نـاوەوە بـێ ناوهێنـان وەرگرتـووە. لـەم ڕووەوە کـاری لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ لە ناو هەموو سەرچاوەکاندا سەر پـشکە و لـە هـەموو ئەو بابەتانە دواوە. ئەگەرچی لەو کارەشدا هەندێ کەموکوڕی و ناتەواوی لەڕووی داڕشتن و پێکهاتنەوە دەبینرێ و ئەمەش بۆتە هۆی هێنانە خوارەوەی رادەی زانستی ئەو باسە.

هەروەکو لەسەرەوە ڕوونمانکردەوە ئەو (ناوی چاوگ، ناو جێگا، ناوی ئامێر)انەی لـە چاوگەوە وەردەگیرێن زۆر بەدەگمەن باسکراون و سەرەڕای ئەوەش تێکەڵکراون لەگەڵ ئەو نموونانەی لە ناوی ئاساییەوە بە ڕێگای (داڕشـتن و لێکـدان)ەوە وەرگـیراون. لـەم ڕووەوە وەکو دەرەکەوێت زۆربەی زۆری زمانەوانانی کورد (نـاوی چـاوگ)ی وەرگیراویـان لەگـەڵ (ناوی واتایی- نـاوی مەعنـەوی)دا جیـا نەکردۆتـەوە[76]، کـە دوو بابـەتی جیـاوازن.

---

(75) لە ناوی چاوگ نەدواوە.

(76) لیژنەی کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی، بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی، چـاپی دووەم، 1972، ل 33، هەروەها ((زمان و ئەدەبی کوردی)) بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی، 1982، ل 17، 19.

یەکـەمیان تـەنها لـە چـاوگەوە وەردەگیرێـت و واتـای کرداریـشی وەکـو چـاوگەکەی هەڵگرتووە، بەڵام هەرچی (ناوی واتایی)یە واتایەکی رووتە و لەناویش و ئاوەڵناویـشەوە وەردەگیرێت. لە بارەی (ناوی بکەر)ی دارێژراو لە قـەدی چـاوگی تێنەپـەڕی گوێزانـەوە (انتقالی)دا کە بەهۆی پاشگری (و — وو) پێکدەهێنرێن لەگەڵ ئەوانەی کـە بـە هـەمان ڕێژە لە قەدی چاوگی تێنەپەڕی (ڕوودان- مگاوعە)ەوە (ناوی بەرکار) پێکدەهێنن تەنها مامۆستا سەعید صدقی نەبێت ڕێژەی یەکەمی بە (ناوی بکەر) داناوە، دەنا مامۆسـتا وەهبی و لیژنەی دانانی کتێبی ((زمان و ئەدەبی کوردی))ی پۆلی پێنجەمی ئامـادەیی ساڵی 1976 و د. مەکاریۆس هەردوو ڕێـژەی (نـاوی بکـەر)ی وەرگـیراو لـە چـاوگی تێنەپـەڕی گوێزانـەوە و ڕوودانیـان بـە (نـاوی بـەرکار)[77] داوەتـە قەڵـەم. هەرچـی ڕاستێکەیەتی ئەوەیە (ناوی بکەر) و (ناوی بەرکار) پێکـدەهێنن. مامۆسـتایان نـووری عەلی ئەمین و جگەر خوێن و لیژنەی زمـان و زانـستەکانی کـۆڕ و مەسـعود محەمـەد و قەناتی کوردۆ ئەو دوو ڕێژەیەیان تێکەڵ کردووە و بە (ناوی بکەر) یان زانیـوە. لیژنـەی یەکەمی دانانی کتێبی ((زمان و ئەدەبی کوردی)) سـاڵی 1972 و د. جـەمال نەبـەز هەمان بابەتی سەرەوەیان- واتە (ناوی بکەر) و (ناوی بەرکار)یان لەگـەڵ یـەکتر تێکـەڵ کردووە. هەروەها د. نەبەز و مەکاریۆس ئەو ڕێژەیەی لە قەدی چاوگی تێپەڕ و پاشگری (وو) پێکدێت تێکەڵ ئەو دوو ڕێژەیە کردووە، کە ڕاستێکەی (ناوی بـەرکار)ە. ئـەم دوو ڕێژەیەی سەرەوەی (ناوی بکەر) لای مامۆسـتا تۆفیـق وەهبـی (بـە دوولایـی — نـاوی بـەرکار) دراوەتـە قەڵـەم و لەگـەڵ ڕێـژەکانی تـری لـە تێپـەڕ دروسـت بـووە لـەڕووی بەکارهێنانەوە لەگەڵ مامۆستایان ئەحمەد حەسەن ئەحمەد و ساڵح حوسـێن پـشدەری و مەکەنزی و مەکاریۆس دەیانخەنە خانەی ئاوەڵناوەوە. محەمەد ئەمین هەورامانی[78] و د.

---

(77) د. کەمال فوئاد، لە موحازەرەی ((وەرگیراوی کردارەکان))ی پۆلی یەکەمی بەشی دیراسـاتی کوردی، کۆلێجی ئادابی زانکۆی سلێمانی ڕۆژی 9، 1973/5/16، بەهەمان بابەتی زانیوە.

(78) محەمەد ئەمین هەورامانی هەردوو شێوە دارژاوەکەی و لێکدراوەکـەی وەکـو نـاوی ئاسـایی و ئاوەڵناو باس کردووە.

ئەوڕەحمان و د. نەسرین فەخری و د. کوردستان موکریانی ئەو دوو بابەتــەی ســەرەوەیان لەگەڵ (ناوی چاوگ) و (ناوی جێگا) و (ناوی ئــامێر)دا لــەژێر (نــاوی دارِژاو) و (نــاوی لێکدراو)ی ئاساییدا باس کردووە. مامۆستا سەعید صدقی و جگەر خــوێن بــە ناویــان دەزانن، تەنها وەکو ناو لێنان کۆڵیوەتەوە، بــێ ئــەوەی هێمــای ئاوەڵناویــان بــۆ بکــەن. هەرچی مامۆستایان نووری عەلی و لیژنــەی دانــانی کتێبــی زمــان و ئــەدەبی کــوردی قوتابخانــە ناوەنــدی و ئامادەییــەکانی 1976 و لیژنــەی زمــان و زانســتەکانی کــۆڕە، بەڕاستی دەوری نــاوی و ئاوەڵنــاوی ئــەم (نــاوی بکــەر و نــاوی بــەرکار)ەیــان لــەڕووی بەکارهێنانــەوە راگەیانــدووە. مامۆســتا (کوردۆییێــف)یــش دەوری (تەواوکــەر)یــانی دەرخستووە. تێکڕا لەڕووی رۆنان و پێکهاتنــەوە هــەموو بنەواشــەکانیان بــە ناتــەواوی خستۆتە بەرچاو، بەلاّم لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ لەناویاندا لە چــاو ئــەوانی تــردا کەم بنەواشە هەیە باسی نەکردبێت. بەتایبەتی (ناوی بەرکار) پــێش لیژنــە تــەنها یــەك دەستووری پێکهاتنیان باسکردووە. کە لە ڕەگی چاوگ و بەهەڵە پاشگری نادیــاری (را) و پاشگری (و)ی (ناوی بەرکار) تێکەڵ کردووە و لێوەی کۆڵڕاوەتەوە، کە لە راستیدا لەو دەستوورە زیاتری هەیە و لــە بەشــی دووەمــی ئــەم نامەیــەدا هــەر هــەموویانمان روون کردۆتەوە.

دواشت کە پێویستە بوترێت بیروڕاکانی مامۆستا مەســعوود محەمــەد بەگــشتی بــە کەڵکە و زۆر لایەنی ئاڵۆزی ئەم بابەتانەی سەرەوەی روون کردۆتەوە(79) کە لە چــاوگەوە وەردەگیرێن، بەتایبەتی دەربارەی (ناوی بکەر و ناوی بــەرکار و نــاوی چــاوگ) لــەڕووی دارِشتن و بەکارهێنانەوە. ئەو دەستوورانەی بۆ دارِشتن و وەرگرتنی ئەو بابەتانەی کــە لــە چاوگەوە وەرەگیرێن وەکو بابەتەکانی سەرەوە لەلایەن هەموو زمانەوانانەوە تەنها بەســەر چەند چاوگێکدا گونجاندوویانە و بــێ ئــەوەی بــە تــەواوی روونیبکەنــەوە و یەکەیەکــەی دەستوورەکانیان دیــاری بکــەن و بەســەر چــاوگەکاندا بنەواشــەی لێــوە هەڵبهــەنجێنن و ناوێزەکانیان دەسنیشان بکەن و تەنانەت هەندێ بنەواشە، کە دایانناوە لە سنووری چەند

(79) لە هەندێ بۆچوون لەگەڵیدا نیم و لە شوێنی خۆیدا لەمە پێشەوە خستوومەتەڕوو.

نموونەیەك تێپەڕ ناكات، كە لە كاتێكدا بنەواشەی تەواوی لێوە دادەنرێت و لە بەشێكی تری ئەم باسەدا هەریەكەیان بە تەواوی روون كراونەتەوە.

هەروەها زمانەوانانی كورد تاكو ئێستا لەسەر ئەوە رێكنەكەوتوون كە ئایا ئەم بابەتانە لە فرمانەوە یا لە چاوگەوە وەردەگیرێن؟. لەم رووەوەش، بێ ئەوەی شتێكیان روون كردبێتەوە، دەبنە دوو بەشەوە. دەمەتەقێ لە سەر ئەوەیە ئایا چاوگ بنەڕەتە و سەرچاوەی داڕشتن و وەرگرتنی فرمانە، یا ئەو جۆرە وشانەن، كە لێیانەوە وەردەگیرێت یاخود فرمان بنەڕەت و بنكەی ئەو دروستبوونەیە. هەندێكیان لە چاوگەوە و هەندەكەی تریان لە فرمانەوە باسەكەیان ئەنجامداوە. ئەمەش هەر لە بەشی دووەمی ئەم باسەدا روونكراوەتەوە كە چاوگ سەرچاوە و بنەڕەتە.

بە كورتی زمانەوانی كورد تێكڕا چەند رێژەیەكی دروستبوونی (ناوی بكەر) یان باسكردووە و بەسەر چەند چاوگێك یا فرمانێكدا دابەشیانكردووە و بێ روون كردنەوە دەستووریان داناوە، بێ ئەوەی دەستوورەكانیان تەواو و گشتی بن یا لێوەی دوابن و شییانكردبێتەوە و ناوێزەكانیان دەسنیشان كردبێت و هۆكەیان دیاریكردبێت.

دەربارەی (ناوی بەركار) تەنها یەك رێژەیان لە چاوگی نادیارەوە باسكردووە و بە هەڵە تێكڕایان نیشانەی نادیاری و پاشگری ناوی بەركاری كە (و)ە تێكەڵكردووە و بە (راو) یان زانیوە كە راستێكەی دوو نیشانە و پاشگری لە یەكتر جیاوازن، سەرباری ئەوەش رێژەكانی تری ئەم ناوی بەركارەیان پشتگوێ خستووە. ناوی چاوگ زۆر یەكەمی لێوەی دواون و یا لەگەڵ ناوی واتایی (مەعنەوی)دا جیایان نەكردۆتەوە.

ناوی جێگایان بەگشتی لە ناوەوە وەرگرتووە. بە دەگمەن زمانەوان هەیە (تازەكانی لێ دەرچێت) لە چاوگەوە وەریان گرتبێ، ئەویش زۆر بەكەمی و بێ روونكردنەوە و بێ داڕشتنی دەستوورێك دەربارەی (ناوی ئامێر)، جگەر خوێن و لیژنەی زمان و زانستەكانی كۆڕ نەبێت بە سەربەخۆیی وەكو بابەتێك لێوەی نەدواون. هەرچی ئەو دوو كارەشن زۆر بە كورتی لێی دواون و ئەوی جگەر خوێنیش زۆر تێكەڵ و پێكەڵە.

چاوگ، وەك بەشێكی یەكجار گرنگی ئاخاوتن دەورێكی دیار و چالاك رادەگەیەنێ و دەبینێت لە زماندا. ئەمە چ بەشێوەی ئاسایی خۆی و چ وەكو وەرگرتن و دارِشتنی وشەی تر لێوەی، بەهۆی رۆنان و لێكدانەوە.

هەروەك دەزانین زمانی كوردی یەكێكە لەو زمانانەی بەهۆی لێكدانەوە، فەرهەنگی زمانەكەی دەوڵەمەند بووە، ئەوەش دەزانین كە چاوگ چ بەرِێگای دارِشتن و چ بە رێگای لێكدانەوە[1]، وشە و زاراوەی بێ ئەژمار لێوەی پێكدەهێنرێت. بەهۆی گەران و خۆ خەریككردن و لێكۆڵینەوەوە، بەرِێگای دارِشتن و وەرگرتن لە چاوگەوە، زمانەوان لەبەر رۆشنایی زمانەكەماندا دەتوانێت یاسا و دەستووری دارِشتن و پێكهاتنی وشە و زاراوەكانی بدۆزێتەوە.

چۆن چاوگ بەشێكی چالاكی ئاخاوتنە هەر بەو چەشنەش لە دارِشتن و لێكدانی وشەی دی وەكو: ناو، ئاوەڵناو، فرمان...دا، كە بەشە ئاخاوتنی دین، دەور دەبینێ.

باسەكەی ئێمەش كە تایبەتە بە (ناوی بكەر، ناوی بەركار، ناوی چاوگ، ناوی ئامێر)ەوە لە چاوگەوە وەردەگیرێن و دەچنەوە ریزی بەشی ئاخاوتنی دی.

بۆ دارِشتنی وشە، چاوگ بە بنەرەت و سەرچاوەی دروستبوون و پێكهاتنی دەزانین، نەك فرمان، چونكە چاوگ و فرمان ئەگەرچی واتای روودان دەگەیەنن بەلاَم چاوگ وەك فرمان كەس و كاتی تێدا نییە. بابەتەكانی سەرەوەش واتایەكی رووتی چاوگەكانیان لەرِووی رووودانەوە دەگەیەنن و وەكو چاوگیش نەبەستراون بەكەس و بەكاتەوە. فرمانیش بێجگە لە رِووداو، كەس و كاتی تێدایە و بۆیەش گەردان

(1) بروانە: ا- د. ئەورەحمانی حاجی مارف، رێزمانی كوردی، ناو، بەغدا، 1979، ل 106، دەڵێ: ((لە زمانی كوردیدا بۆ رۆنانی ناو چەند رێگەیەك هەیە. ئەوەی لە ناویاندا سەرەكی بێ (دارِشتن) و (لێكدان)ە)).

ب- د. كامیل بەسیر، زاراوەی كوردی، زانكۆی سلێمانی، 1979، ل 62، دەڵێ، ((زمانی كوردی.... زمانێكی (لەصقی) واتە بەیەكانووساوە...)). لەم رووەوە دكتۆر ئەوەی راگەیاندووە كە بەهۆی لێكدانەوە وشەیەكی زۆر لە زمانەكەدا پێكدێت.

دەکرێت. کەواتە ئەو جۆرە وشانەی سەرەوە لەم ڕووەوە ئەگەر جارێك لە چاوگەوە دوور بن، ئەوە دوو جار لە فرمانەوە دوورترن.

لەڕووی ڕۆنانەوە چاوگ نەك فرمان بەسەرچاوە و بنەمای وشە دارِشتن دەزانین. چونکە فرمان و هەموو جۆرەکانی بە (رابردوو، رانەبردوو، داخوازی)یەوە خۆیان ڕەگ و قەدەکانیان لە چاوگەوە بەلادانی (ن)ەکەی یا پیتەکەی پێشی وەرگیراون و بەهۆی خستنە سەری نیشانەی تایبەتی بەجۆری فرمانەکە و پێوە لکاندنی ڕاناوە لکاوە کەسێکانەوە ئەوسا دروستدەبن و جۆری فرمانەکان دیاریدەکرێن. کەوابوو فرمان خۆی دارێژراوە و لە چاوگەوە وەردەگیرێ. بۆ بەڵگە فرمانی رانەبردوو هەروەها داخوازیش بێ نیشانە و راناوەکانی کە بەهۆیانەوە دروستبوونە و هیچ واتایەك نابەخشن. وەك:

دەڕۆم: فرمانی رانەبردووە لە ڕەگی چاوگی (ڕۆیشتن)ەوە وەرگیراوە و بەلابردنی (دە)ی نیشانەی رانەبردوویی و راناوە لکاوەکەی (ڕۆ) دەمێنێتەوە. ئەگەر چی پارێزەری مانای بنەمای چاوگەکەیە و لەڕووی دارِشتنەوە هەڵس و کەوتی وشەی لەگەڵدا دەکرێت بەلاّم هیچ واتایەك نابەخشێت. لە پاشاندا ڕاناوەکان لەگەردان کردندا گۆڕانیان بەسەردا دێت لە تێپەڕەوە بۆ تێنەپەڕ هەروەها لە رابردوو بۆ رانەبردوو داخوازیش لەگەڵیاندا. کەواتە فرمان خۆی لە خۆیدا وشەیەکی سەربەخۆ نییە لەڕووی پێکهاتنەوە چونکە مۆرفیمی تری جیاواز لە دروستبوونی جۆرەکانی بەشدار دەبن وەك:

{دە –} 1ی: نیشانەی رانەبردوویی، دەکەم، دەنووسم.

{دە-} 2 ی: نیشانەی رابردووی بەردەوامی وەك: دەخوارد.

(بوو): بۆ رابردووی دوورە وەك: خواردبوو.

کەچی چاوگ خۆی وشەیەکی سەربەخۆیە و هیچ مۆرفێمێکی تری رێزمانی بەشداری پێکهاتنی ناکات. تەنانەت (نون)ەکەشی هی بنەڕەتی چاوگەکە خۆیەتی و لە هەموو چاوگێکدا هەیە و ناگۆڕێت بەلاّم هەرچی نیشانەکانی فرمانە پێوە لکاوە و لە گەردان کردندا بۆ نموونە راناوە لکاوەکانی دەگۆڕێت وەك:

رۆیشتم، رۆیشتیت، رۆیشت)

رۆیشتین، رۆیشتن، رۆیشتن)        بۆ رابردوو

دەڕۆین، دەڕۆن، دەڕۆن)

دەڕۆم، دەڕۆیت، دەڕوات)        بۆ رانەبردوو

بنووسە، بنووسن)        بۆ داخوازی

بۆیە لەڕووی دارِشتنەوە[2] چاوگ بەسەرچاوەی وشە رۆنان دەزانین.

بابەتەکانی ئەم باسەش وەك (ناوی بکەر، ناوی بەرکار، ناوی چاوگ، ناوی جێگا، ناوی ئامێر) لە چاوگەوە بە یارمەتی پێشگر و پاشگرەوە پێك دەهێنرێن.

ناو لەڕووی وەرگرتنەوە دوو جۆرە[3]:

1- ناوی ناسادە: ئەو ناوانەن کە بەرِێگای دارِشتن لە وشەی سەربەخۆی ترەوە وەردەگیرێن.

2- ناوی سادە: ئەو ناوانەن کە سەربەخۆ هەن و لە وشەی ترەوە وەرناگیرێن. وەك: ئاسن، شاخ، پیاو، شار، شێر.

لێرەدا تەنها لە جۆری یەکەمی دەدوێین، کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن و لە سەرەوە بابەتەکانیمان دیاریکرد، وەك:

---

(2) بڕوانە بیروڕای قوتابخانە زمانەوانە بەسراوییەکان کە بەلایانەوە، چاوگ بنەڕەتە، نەك فرمان، چونکە چاوگ سەرچاوەی وەرگرتنی فرمانە، نەك فرمان بنەڕەت و سەرچاوە بێت. لەم رووەوە دەڵێن ((چاوگ جیاوازە لە فرمان، چونکە وەکو ناو وایە و کاتی تێدانییە، بەلاّم واتای رووداو و کرداری وەك فرمان تێدایە. لەم بارەیەوە، بڕوانە: د. عبدە الراجحی، التطبیق الصرفی، بیروت، 1957، ص66.

(3) بڕوانە: ا- سەعید صدقی، مختصر صرف ونحوی کوردی، بەغدا، 1928، ل 17.

ب- نووری عەلی ئەمین، رێزمانی کوردی، سلێمانی، 1960، ل 127. کە ئەم بابەتانەی سەرەوەیان لە چاوگەوە وەرگرتووە نەك فرمان.

## بابەتی یەکەم

## ناوی بکەر (اسم الفاعل – Agent)

ناوی بکەر بەو وشانە دەوترێت کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن و واتای رووداوێـک لـە لایـەن ئـیش کـەرەوە دەگەیـەنن و توانـا تایبەتێکـەیان سـیفەتێکی بـەردەوام و هەمیشەییان پێدەبەخشێت.

ناوی بکەر لە ڕووی پێکهاتنەوە دوو جۆرە:

1- ناوی بکەری داڕێژراو.

2- ناوی بکەری لێکدراو

ناوی بکەری داڕێژراو لەڕووی جۆری چاوگەکەیەوە دوو جۆرە:

أ- ناوی بکەری داڕێژراو لە چاوگی تێنەپەڕی گوێزانەوە (انتقالی).

ب- ناوی بکەری داڕێژراو لە چاوگی تێپەڕەوە.

### ناوی بکەری داڕێژراو:

ئەو ناوەیە لە چاوگی سادە و داڕێژراوی تێنەپەڕ و تێپەڕەوە بە یارمەتی پێشگر و پاشگرەوە وەردەگیرێت، وەکو: هاتوو، دانیشتوو، هەڵچوو، نووسـەر، بکێـڵ، کڕیـار، داپاچ، گەڕۆك، تەریدە، زانا.

ا- ناوی بکەر لە چاوگی تێپنەڕی گوێزانەوەدا بەلادانی نونی چاوگ و پێوەلکـانی پاشگری (و – w) بۆ سەر قەدی چاوگی کۆتایی هاتوو بـە (ا، ی) سـازدەبێ، بـەڵام ئەگەر بە (ت، د) بن ئەوا (وو- ū)ی پێوە دەلکێت(4)، وەك:

(4) بڕوانە: ك. ك کوردۆییێف، ڕێزمانی کوردی، وەرگێڕانی لە روسیەوە د. کوردسـتان موکریـانی، هەولێر، 1984، ل 214.

| چاوگی تێنەپەڕ | قەدی چاوگ | پاشگر | ناوی بکەری دارێژراو |
| --- | --- | --- | --- |
| هەستان | هەستا | و | هەستاو |
| گریان | گریا | و | گریاو |
| دانیشتن | دانیشت | وو | دانیشتوو |
| گەیشتن | گەیشت | وو | گەیشتوو |

ئەم ڕێژەیە لە چاوگی (واو)ی تێنەپەڕی ناوێزەی (چوون، بوون)ەوە لە شێوە سادەکەیەوە وەرناگیرێن، چونکە لەگەڵ ڕێژە رابردووە نزیکەکەیەوە تێکەڵدەبن و واتای (ناوی بکەر) تەنها بە دارڕژاوی دەبەخشن نەك بە سادەیی ((ئەگەر مصدەرەکە واوی و تێکەڵبوو وەکو (هەڵچوون، لاچوون) اکتفا بەواوەکەی خۆی دەکرێ، یعنی هەر بە فرێدانی نون مصدری پێکدێ. وەکو (هەڵچو، لاچو، ((هەڵبو)) فقط بەلهجە و قرینە لە ماچی شهودی جوێ دەکرێنەوە[5])). چەند نموونەیەك:

دانیشتووی ناو کۆشك و قەڵا

دەخۆن نانی گەڵا گەڵا

(تاریك و روون، ل د)

وا ئێستا ئەو کەوتوو، من لەجێ هەڵساوم

کوناو کون ئەگێڕم لەشی تێك شکاوم

(دیوانی گۆران، ل 364)

مامەکوڕنو ڕاکشاوی گردی سەیوانەکەم

سەر ڕەحەت دڵ بێ گرێ گوێ شل کە بۆ داستانەکەم

(دیلان، ل 206)

وەستاوم، سا دڵم خۆش کە

(5) سەعید صدقی، سەرچاوەی پێشوو، ل19.

شیعری پێشووم فەرامۆش کە

(دیوانی گۆران، ل 40)

ئەم ڕێژەیەی سەرەوە لایەنی بکەرێتییان بەشێوەی سادەییان بەهێزترە لەوانەی لە چاوگی دارِژاو و لێکدراوە و وەرگیراون، چونکە دارِژاو لێکدراوەکانیان ئەگەر چی لە بەکارهێناندا دەوری بکەرێتیش دەبینن(6)، بەلاّم لایەنی ئاوەڵناوی یان ئاشکراو دیارە، بەتایبەتی لەگەڵ ئاوەڵفرماندا، وەك: پاش کەوتوو، هەڵکەوتوو، داکەوتوو، پێگەیشتوو، دۆش داماو، سەرکەوتوو.

خۆت لە مزگەوتا پێگەیشتووی

دەنگی وایە کەوا پاکیان نەهێشتووی

(پیرەمێرد، ل 207)

سەری ڕاهاتووی تاجی سەربەستی

کەی ئەنەوێ بۆ زیندان پەرستی؟

(دیوانی گۆران، ل 187)

گەلی دواکەوتوو بەشی جەخارە

قوڕ بەسەر ئەوەی پەست و هەژارە

(بێکەس، ل68)

شاعیر ماڵ شێواو بۆ دژ داماوی

کیژی خەو ئالّوو، شێتی خەرفاوی

(تاریك و روون، ل 76)

ئەم ڕێژانە (نە)ی نەرێش وەردەگرن و دەبنە ئاوەڵناویش وەکو: نەهاتوو، نەگەیشتوو.

---

(6) لە شوێنی خۆیدا ئەوەش روون کراوەتەوە لە لاپەڕە (117).

ئەم ڕیژە ناوە بکەرانە لەبەر ئەوەی لایەنی بزووتنەوە و هەڵس و کەوتوو بکەریتی یان لەلایەن خاوەن کارەکانیانەوە تیدا روون و ئاشکراو دیارە، بەناوی بکەر دادەنرین و لەم رووەوە ئەم ریژەیە لەگەڵ ئەو ریژەیەی کە بەهەمان شیوە لە قەدی چاوگی رووداوەوە رۆدەنریت بە هەڵە لەلایەن زۆربەی زمانەوانی کوردەوە هەر بەناوی بکەر دانراوە یا تیکەڵ کراوە و هەردووکیان بەناوی بکەر دانراون، بیٚ ئەوەی هیچ بەڵگەیەك هینرابیتەوە... راستیکەی ئەوانەی لە چاوگی رووداوەوە پیکدین ناوی بەرکارن نەك ناوی بکەر.

ئەمجا ریژەی دووەم (ناوی بەرکار)ە، چونکە بکەرەکانیان دیار نییە و ئیش و کاریان بەسەردا هاتووە، نەك کردبیتیان. لەم رووەوە پیویستە نموونەیەك بۆ بەڵگەی راستی ئەم بۆچوونەمان بهینمەوە وەکو: (رژاو، خنکاو، پساو، مردوو...). ئەمانە ئیشیان بەسەردا هاتووە، نەك ئیشیان کردبیت و بکەرەکانیان دیار نییە(7)، بەڵام ریژەی یەکەم کە لە چاوگی گویزانەوەن، ناوی بکەرن. دیارە وەکو ناوی بکەری (کەوتوو، هاتوو، نووستوو، گریاو، داماو...) کاریان کردووە و خاوەن کارەکە بکەرەکانیانن، واتە، ئەوانەی کاری (کەوتن، هاتن، نووستن...) یان کردووە-. نموونە:

دوانزە مانگ لە یار براویٚ

دوانزە مانگ، بۆ یار گریاویٚ

(دیوانی گۆران، ل 23)

هەروەها (ناوی بکەر) بە ریژەیەکی کەم لە قەدی چاوگی تینەپەڕ و پاشگری (ە)ەوە پیك دەهینریت(8)، وەکو:

لیکەوتن: لیکەوت+ە= لیکەوتە

---

(7) بڕوانە: د. وریا عومەر ئەمین، تینەپەڕ فرمانیکی بکەر نادیارە، گۆڤاری ((رۆشنبیری نویٚ))، ژ 107، بەغدا، 1985، ل 197.

(8) بڕوانە: ریزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپیی لیکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد، ل 246.

پەك كەوتن: پەك كەوت+ە= پەككەوتە

ب- ناوی بکەری دارِژاو لە چاوگی تێپەرِەوە:

ئەم ریژەیە لەرِەگی چاوگی تێپەرِ و پێشگر و پاشگرەوە وەردەگیرێت، وەك:

1- لە رِەگی چاوگی تێپەرِ و پاشگری (ەر)ەوە، وەك:

نووسین: نووس+ەر= نووسەر[9]

بینین: بین+ەر= بینەر

خوێندن: خوێن+ەر= خوێنەر

ئاخاوتن: ئاخێو+ەر= ئاخێوەر (بزوێنی (1) دەگۆرِێت بە (ێ) لە وەرگرتنی رِەگی چاوگەکەدا. ئاخاوتن تێنەپەرِە)

لێدان: لێدە+ەر= لێدەر (بەتێچوونی بزوێنی (ە)یەکیان).

راخستن: راخە+ەر= راخەر (هەمان هۆ)

هێنان: هێن+ەر= هێنەر

دانان: دانێ+ەر=(بەتێچوونی بزوێنی (ێ) بەپێی تایبەتێتی فۆنەتیکی رێزمانی کوردی دەبێتە= دانەر.

لەسەر ئەو شێوەیەی سەرەوە ئەمانەی خوارەوە دروست دەبن:

بەخشین: بەخش+ەر= بەخشەر

راکێشان: راکێش+ەر= راکێشەر

فرۆشتن: فرۆش+ەر= فرۆشەر

ناردن: نێر+ەر= نێرەر (نێنەر)

پێوان: پێو+ەر= پێوەر

چاند: چێن+ەر= چێنەر

---

(9) نووری عەلی ئەمین یەکەم رێزمان نووسە کە پاشگری ((ەر))ی بەسەرخۆیی بەکارهێناوە. برِوانە کتێبی رێزمانی کوردی، ل 36.

کوشتن: کوژ+ەر= کوژەر (لە ئەنجامی وەرگرتنی ڕەگەکەیدا دەنگی نەبزوێنی (ژ)ی ئاوازەدار گۆڕاوە بە کپی (ش). Dissimilation.

نیشاندانی تەواوی ئەو نموونانەی سەرەوە زیاتر یارمەتی روونکردنەوە و شیکردنەوە و تێگەیشتنی بنەواشەکە دەدات، چونکە ((کەرت کردنی ناو لەڕووی مۆرفۆلۆژییەوە لە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا کارێکی گرنگە. ئەمە نەك تەنیا چۆنیەتیی رۆنان و پێکهاتن و- دروستبوونی ناو ئاشکرا دەکا، بەڵکو یارمەتی روونکردنەوەی تەواو و قووڵتری ماناو ناوەڕۆکیش دەدات و پێوەندی لەگەڵ وشەی تردا دیاری دەکا[10])). ئەمەش چەند نموونەیەکە بۆ بەڵگە:

موسیقاو هەڵبەستی نەبزی دڵ یەکخەر
نیگاری بەجوانی سرنج ڕاکێشەر
(دیوانی گۆران، ل 254)

من نیم ئەوە، هەر خۆیەتی کۆڵ نەدەر
کۆنە رووخێن بنیاتی تازە دانەر!...
(دیوانی گۆران، ل 295)

بۆ پیری نووسەر دڵ گەنج بەیاداشت
کە باخی مێژووی بۆ لاوانمان ناشت
(نەجمەدین مەلا، رۆژی نویٚ، ژ(7)، ل 68)

هۆشەنگی باپیری ئێمەو...
داهێنەری بنچینەی ئاوەدانی
(دیوانی گۆران، ل 195)

بەرە و بەرزی دەچم ئەگەر چی وردم
خاکی بەر پێی تێکۆشەرێکی کوردم

---

(10) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، رێزمانی کوردی ((ناو))، ل 106.

(هێمن، ناڵەی جودایی، ل90[11])

ئەم پاشگری (ەر)ە پاشگرێکی زۆر بەکار و لەبار و چالاکە بۆ رۆنانی وشەی دارِژاو و (زاراوە). دەتوانێ لەگەڵ ڕەگی هەموو چاوگە تێپەڕەکان و بەتێپەڕ کراوەکاندا- بەهۆی (اندن)ەوە- ناوی بکەری دارِژاو پێکبهێنێ وەکو ئەوانەی لە سەرەوە کە لە چاوگە تێپەڕەکانەوە سازکراون و وەك ئەمانەی خوارەوەش کە لە بە تێپەڕکراوەکانەوەن و (ا)کەیان دەگۆڕێت بە (ێ) لە وەرگرتنی ڕەگەکانیاندا، وەك:

روخاندن: روخێن+ەر= روخێنەر

بەزێنەر، برژێنەر، سووتێنەر، نوێنەر، خنکێنەر، توقێنەر.

هەروەها لە دەنگە سروشتییەکانەوە کە کراون بە چاوگی تێنەپەڕ، وەکو:

گرماندن: گرمێن+ەر= گرمێنەر

حیلێنەر، بارێنەر، قیژێنەر، مرقێنەر... بەلاّم لە ئاخاوتن و نووسیندا کەم بەکار دەهێنرێ وەکو بەتێپەڕکراوەکان نین، کە بەکارهێنانیان مەودایەکی بەرفراوانیان هەیە.

نموونە:

هەی کفرکەر — هەی روخێنەر

(گۆران، ل 284)

کەللەیەکی ژێر مێزەر

بزنە ریشەی سابرێنانە مرقێنەر

(گۆران، ل 293)

پاشگری (ەر) توانای ئەوەی هەیە بەدوو شێوە لەگەڵ ڕەگی چاوگە تێپەڕەکاندا (ناوی بکەر) پێك بهێنێت:

1- لەگەڵ چاوگە ئاساییەکاندا. لەسەرەوە خستمانەڕوو.

2- لەگەڵ چاوگە ناوێزەکان (شاژ)دا. ئەوانەی لە وەرگرتنی ڕەگەکانیاندا دەستووری نین و بەلادانی نیشانەی چاوگ[12] یەکسەر ڕەگەکانیان وەرناگیرێن،

---

(11) لە مەولا لەباتی (هێمن، ناڵەی جودایی) تەنها (ناڵەی جودایی) دەنووسین.

هەروەها ئەو ڕەگانە لە واتای چاوگەکانیانەوە تەواو دوور کەوتوونەتەوە. جا ئەم جۆرە چاوگانە بە سادەیی پاشگری (ەر) وەرناگرن.

تا بەهۆی پێشگرەوە نەکرێن بەدارڕژاو. واتە بە چوونە سەری (ەر) نە واتای چاوگەکانیان هەڵدەگرن و نەواتاش دەبەخشن و ((ناشێ بڵێین ڕەگی فیعلەکە بە تەنها واتای تەواوی هەیە چونکە بەڕاستی واتای تەواوی نییە: تۆ کە گوتت (خۆر، شۆر، کەر...) کەس تێت ناگا مەبەستت چییە تا نەڵێی (نانخۆر، جلشۆر، تێکەر،....))[13].

بەڵام لەڕووی پێکهاتنەوە بریتین لە ڕەگی چاوگ و پاشگری (ەر)ی ناوی بکەری و بەهۆی تایبەتێتی فۆنەتیکی زمانی کوردیەوە، وەکو دەستوورێك دوو بزوێن نارێك و نەبارە ناتوانن بچنە سەر یەکتری و لە ئەنجامدا یەکێکیان تێ دەچێت. جا تائێستا بە هەڵە ئەم جۆرە ڕەگی چاوگانە و پاشماوەی گۆڕانی پاشگری (ەر)، وەکو (کەر، بەر، دەر،...)[14] بە پاشگری دادەنێن، کە لە ڕاستیدا بریتین لە ڕەگی چاوگ و پاشگری (ەر) وەکو:

داکردن= کەر: کە+ەر= کەر= داکەر

رابردن= بەر: بە+ەر= بەر= رابەر

خواردن= خۆر+ەر= خۆر= بخۆر

رادان= رادە+ەر= رادەر (وەکو ئاوەکە رابدە).

دان= بـ+دە+ەر= بدەر (بەتێچوونی بزوێنێکیان).

---

(12) نیشانەی چاوگ مەبەست لە (نونی) چاوگەکە و پیتەکەی پێشێتی.

(13) بڕوانە ڕای: مەسعوود محەممەد، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لێژنەی زمانو و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد، ل 84.

(14) (بەر): بێجگە لە ڕەگ و پاشگری (ەر) واتای تریش دێت وەکو: (بەر) بە واتای لەش، بەواتای نزمایی، بەواتای بەری میوە، بەواتای لایەك بۆ جێگە وەکو (ئەم بەری دارەکە)... هتد، هەروەها (دەر)یش بە واتای تر دێت وەکو دەروازە و دەرەوە... هتد.

پاشگری (ەر) چالاكە بەو شێوەیەی لە سەرەوە نیشانماندا لەگەڵ هەموو چاوگە تێپەڕەكاندا بۆ پێكهاتنی (ناوی بكەر) خۆی دەنگوجێنێت، چونكە پاشگری (ەر)یش بۆ دروستكردنی ناوی بكەر یا ئاوەڵناوی بكەری دارێژراو بەكار دەبرێ لەگەڵ كرداری سادەدا بێ، وەك: نووسەر (لەسەرەوە نیشانمان داوە) یا ناسادە. ناسادەش بە هەردوو جۆرەكەیەوە لێكدراو، وەك: رەنج بەر... دارێژراویش، وەك: داهێنەر، دانەر... كە لە (داهێنان) و (دانان)ەوە وەرگیراون. ئەمەش چەند نموونەیەكی ترە كە دەستوورێك پێكدەهێنن بۆ (ناوی بكەری لێكدراو) لە چاوگی لێكدراوەوە(16):

پەیام بردن: پەیام بە+ەر= پەیام بەر (بە تێچوونی بزوێنێكیان)

نان كردن: نان كە+ەر= نانكەر (بزوێنێكیان تێچووە).

خوێن بردن: خوێن بە+ەر= خوێن بەر (بە هەمان هۆ)

راوكردن: ڕاوكە+ەر= ڕاوكەر (بەهەمان هۆ)

ئیش كردن: ئیش كە+ەر= ئیش كەر (بەهەمان هۆ)

سواڵ كردن: سواڵ كە+ەر= سواڵكەر (بە هەمان هۆ)

نان بردن: نان بە+ەر= نانبەر (بە هەمان هۆ)

رەنج دان: رەنجدە+ەر= رەنجدەر (بە هەمان هۆ)

رێ بردن: رێ بە+ەر= رێبەر (بە هەمان هۆ)

تەگبیر كەرە نەمرێ، فرمانكەرە بمرێ
(پەندی پێشینان، ل51)

((نالی)) لەبی (حەبیبە) هەم گیب و هەم گەبیبە
خولاصەیی لەبیبە، فەرمانبەری لەبیبە
(نالی، ل 398)

تۆ كاڵەك خۆریت یا بێستان رنیت

(16) لەبەر لە یەكچوونی باسەكە ئەم بەشە لێكدراوەی (ناوی بكەر)مان بەهۆی (ەر)ەوە پێشخست لەگەڵ دارژاوەكەیدا لە پێكهاتندا لە یەكتر دەكەن.

(پەندی پێشینان، ل 50)
دەست لە ئەستۆی یەك دەكەن ئازاد و شاد و بەختەوەر
كیژو كوڕ، لاو و گراوی، دڵبەر و دڵداری كورد
(تاریك و روون، ل 125)
بەرتیل خۆر و گورگە مێش
وەك سەگی سەر خۆڵەمێش
(تاریك و روون، ل 98)

بەم نموونانەدا دەردەكەوێت كە پاشگری (ەر) لە زمانی كوردیدا بناغەی بوونی داكوتاوە، چونكە بەزۆری چۆتە سەر ئەو چاوگانەی كەوا لە ئیش و كاری رۆژانەدا بەكارهێنانیان زۆرترە لەوانی تر. باشترین نموونەش بۆ كۆنی (پێغەمبەر- نانكەر)ە كە ناوی بكەرن. ئەمجا لەگەڵ ڕەگی چاوگەكانی تریشدا لە كۆندا بەكارهاتووە، بەلاّم ((لەبەر ئەوەی هەمیشە لەسەر زاری بوونە سووك بوونەتەوە و دەنگی (ر)ەكەیان لێوە كەوتووە ئەم نموونەیەش ئاشكراتر دەبێت كاتێ لە كۆنە دیوانانی شاعیران بگەڕێین، جزیری دەڵێت[17])).

قەدەرەك شەفقە ژ لوگفا تە تمنی دكرێن دا
مە مەحرومی نەدیری تو ژ لوگفی و نەڤهری[18]

هەروەها بۆ ئیسپات بوونی (ە ر)و كۆنی لە زمانی كوردیدا دەبینین لە شێوەی كرمانجیی سەروودا بوونی پارێزراوە. بەوێنە دەبینین، ناوی بكەری داڕژاو و لێكدراو لە

(17) بڕوانە: فازل عمر، نێڤگر د زمانی كوردیدا (رۆشنبیری نوێ)، ژ 109، ل 265. دەڵێ: بەلاّوترین یاسا بۆ دروستكردنی ناوی بكەر لە زمانی كوردیدا ئەمەیە: ناو + ڕەگی فرمان (فرمانی تێپەڕ)= ناوی بكەر وەك: پێغەم + بەر= پێغەمبەر.
(18) دیوانا جزیری، س. ب. ئامێدی، بەغدا، 1977، ل 534. لە (ل، 274) گۆڤاری رۆشنبیری نوێی هەمان ژمارەی سەرەوە لە وتارەكەی كاك فازل عمرم وەرگرتووە.

چاوگی (خواردن)دا بریتییە لە ((خـوەر، نـانخوەر))[19]. لـەم ڕووەوە مامۆسـتا فـازل عومەر دەڵێ: ((ئەم دبێژین، پێغەمبەر، نانخوەر/نانخۆر، بالبەر، کارگەر، مێرکـوژ... هتد ئەرێ ڕێزمانکی، جواد هی دتیقبەرا، بەر، خوەر، خۆر، کـەر... هتـد دا هەیـە؟ دێ بینین هەمیان داوی یان ناڤان گرتییە و نـاڤی بکـەری دروسـتکرییە))[20]. ئـەمجا ناوی بکەری (نانخوەر) وەکو (نانکەر و دلبەر) یەك ڕێژەیان هەیە و بـریتین لـە ڕەگـی چاوگ و پاشگری (ە ر). ئەمەش بەڵگەیەکە (کەر) پاشگری نییە، بەڵکو وەکو چـەند جارێك ڕوونمان کردۆتەوە پێکهاتووە لە ڕەگی (کە) و پاشگری (ە ر)ی نـاوی بکـەری. لە ئەنجامی کۆبوونەوەی دوو بزوێنی (ە)شدا یەکێکیان تێچووە. ئەمـە ڕەسـەنایەتی و کۆنی ئەم پاشگرە نیشاندەدات. واتە (کەر)یش وەکو (بەر، خۆر، دەر) پاشگر نییە.

جا بۆ سووك بوونـەوەی زۆر وشـەی (نـاوی بکـەر) دەنگـی (ر) سـواوە و سـووك بۆتەوە. واتە لە جیاتی (بخۆر، بدەر)، (بخۆ، بدە) بەکار هـاتووە. وەك: پـیرۆت بخۆیـە، جوامێر نان بدەیە. ڕێژەیەکی تری بەشـداربوونی پاشـگری (ەر) لـە داڕشـتنی (نـاوی بکەری داڕژاو)ی لە چاوگی تێپەڕی ناوێزەوە وەکو لە (ل 84)دا هێمامان بۆ کرد، لـە پێشگری (بـ)و ڕەگی چـاوگ و ئـەم پاشـگرەوە[21] پێکـدەهێنرێت و ((... هەنـدێك ماکی چاوگەکە بخرێتە ناو ((بـ... ەر)) دەبێتە (نـاوی) بکـەر وەکـو: بکـەر، بـدەر، بخوەر))[22]. وا لە خوارەوە بە تەواوی ئەو شێوە داڕشتنەی ناوی بکەر دەخەینە پـێش چاو، وەکو:

---

(19) بڕوانە: جگەر خوێن، سەرچاوەی پێشوو، ل 48.

(20) فازل عومەر، هەمان سەرچاوی پێشوو، ل 274.

(21) محەممەد ئەحمەد سەعید، چەند سـەرنجێکی زمانـەوانی دەربـارەی کتێبـی ڕێزمـانی کـوردی، گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ))، ژمارە 93، 1986، ل 42.

(22) گیوی موکریانی، ئەلف و بێی کـوردی وێنـەدار بـە تیپـی لاتینـی، چـاپخانەی کوردسـتان هەولێر، 1972، ل 139.

| چاوگ | پێشگر | ڕەگ | پاشگر | ناوی بکەری داڕژاو |
|---|---|---|---|---|
| کردن | بـ | کە | ەر | بکەر |
| دان | بـ | دە | ەر | بدەر |
| خواردن | بـ | خۆ | ەر | بخۆر |
| بردن | بـ | بـ ە | ەر | ببەر |
| خستن | بـ | خـە | ەر | بخەر |

لە وەرگرتنی ئەم ڕێژە ناوە بکەریانەدا دوو بزوێنـی (ە، و)ی ڕەگـی چـاوگەکان و پاشگرەکە لە ئەنجامی چوونە سەر یەکتریان بـەپێی دەسـتووری دەنگـسازی کـوردی، (ە)یەکیان تێچووە.

ئێستا دەرکەوت کە ئەم جۆرانەی سـەرەوە لـە پێـشگر و ڕەگـی چـاوگی سـادە و پاشگر پێکهاتوون و شێوەی ناوە بکەریە داڕژاو و لێکدراوەکەی کە لە چـاوگی داڕژاو و لێکدراوەوە وەردەگیرێت پێشگری (بـ) لەو پێکهاتنەیان بەدەرە و تەنها پاشـگری (ە ر) لەگەڵ ڕەگەکانیانـدا (نـاوی بکـەری داڕژاو و نـاوی بکـەری لێکـدراو) بەشـداری دەکات[23] وەکو لەسەرەوە لە باسی ئەم ڕێژەیەدا خستمانە بەرچاو: (بڕوانە ل 85).

نان خواردن: نان+ خۆر+ ەر ـــــ نان خۆر (نانخوەر)

دارکردن: دار+ کە+ەر ــــــ دارکەر

داخستن: داخە+ ەر ـــــــ داخەر (بەتێچوونی (ە)یەکیان)

تێکدان: تێکدە+ ەر ـــــ تێکدەر (بە هەمان هۆ)

---

(23) هەمان پەراوێزی ژمارە (20) و هەمان لاپەڕە.

لەخستنە بەرچاوی تەواوی ئەم ڕێژەیەی (ە ر)دا بەتایبەتی لە چاوگە ناوێزەکاندا کە ((کەر، دەر، بەر))[24] کە ڕەگی چاوگەکانی (کردن، دان، بردن)ن و پاشگر نین و ڕەگ و پاشگرن، وەکو لە نموونە و دەقەکانی سەرەوە خستماننەڕوو. چەند نموونەیەك:

سوالکەر توورەکەی پڕو ڕووی ڕەشە.
(پەندی پێشینان، ل 91).

ئاهەنگێکی گیان پەروەرە
شادی هێنە خەفەت بەرە
(هێمن، ل 89)

ئینسانی ئەو حەلەی بۆ خۆشی هەولدەر
بێ خەم بەختیار ژین ئەباتە سەر
(دیوانی گۆران، ل 256)

چارەی نەخۆر بخۆرە
(پەندی پێشینان، ل 55)

ناوی بکەری داڕژاو هەیە لە پێکهاتنیدا ڕەگەکەی وەرەگرین و ((ە ر))ی دەخەینە سەر، بەتایبەتی لە چاوگی (ناردن)دا، کە ((نێر))ە دەبێتە ((نێرەر)). لێرەدا دەتوانرێ و ئاسایشە نەبزوێنی (ن) شوێنی یا دەوری (ر)ی نەبزوێن وەرگرێ و وەکو نیمچە بزوێنێك بچێتە نێوان هەردوو بزوێنی (ێ، ە) کە و لەیەکیان جیا بکاتەوە، ئەمە لە ئاخاوتن و نووسینیشدا بەکار دێ. شێوەی وەرگرتنەکەی:

ناردن نێر + ەر ——— نێرەر ——— نێنەر.

دواشت بۆ بەلگەی کۆنی (ە ر) لە زمانی کوردیدا، ئەوەیە زۆربەی پاشگرە هاوبەشەکانی (ناوی و فرمانی) دەوری کاریگەر لە دروستکردنی وشەی داڕژاو، لە ناو

---

(24) مەسعوود محەممەد لە بارەی (ە ر)ەوە دەڵێ: (... لەلای نووسەرانەوە بەکارهێنران بە قیاس لە (نان دەر، ئیش کەر..). بڕوانە: زاراوە سازیی پێوانە، (ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە 111، ساڵی 1986، ل 265.

و ئاوەڵناو دەبینن بۆ وێنە (گـە، ە ن، ار، ۆك، ە ك، ك... هتـد) وەك لـە وشـەکانی (کارگە- ناوییە، ڕوانگە — چاوگییە هـەروەها قۆپـەن و سـووتەن، بنـار و کوشـتار، تیرۆك و گەڕۆك، پەتك و سووتك، دەستەك و پەستەك و گەلێکی تـر. دڵنیـام لـەوەی ((ە ر)) لەگەڵ ناویش و ڕەگی چاوگیشدا بەکارهاتووە و وشـەی داڕژاوی پێکهێنـاوە. بۆ وێنە:

چەپەر (دەرگای پەرژینی باخچەی لە دار و قامیش دروست کراوە)، کە لە (چـەپ +ەر) سازیووە. هەروەها وشەی سەنگەر لە (سەنگ+ەر)، کۆچەر کە (ناوی بکەر)ە لە (کۆچ+ەر) لە ناو و پاشگری (ە ر) پێکهاتووە.

نموونە:

شەنگەبێری یارو دەسباری کوڕی کۆچەر نەبی
چۆن دەگاتە جێ هەوار و هۆبە ئەو بارگە و بنە
(تاریك و روون، ل 71)

چەپەر سووتا، پەرژین سووتا
ئەها ئاوازی ژین سووتا
(دیلان، ل 321)

هەموو بێ باك و دڵپاك و مێرن
لەناو سەنگەردا لە وێنەی شێرن
(تاریك و روون، ل 78)

پاشگری ((ەر)) لەڕووی واتاوە (بزووتنەوە و جووڵـە و چـالاکی) دەبەخـشێت لـە تێکڕای وشەسازی کوردیدا.

ئەم پاشگرە دەبێتە ((... هۆی دروستکردنی ناوی بکەری داڕژاو بۆ ناوی بکـەری لێکدراویش بەکاردێن))[25]، وەك:

ئاودان: ئاودە+ەر= ئاودەر (بە تێچوونی بزوێنێکیان)

---

(25) زمان و ئەدەبی کوردی، بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، ل 32.

پیّ لیّ خستن: پیّ لی خه+ەر= پیّ لیّ خەر (هەمان هۆ)

ژن هێنـان: ژن هـێن+ەر= ژن هێنـەر[26] (ئـەم جـۆرە تـەنها لـە ڕەگـی چـاوگی لێکدراوەکەشەوە دەبێت.

لەناوبردن: لەناوبە+ەر= لەناوبەر (بە تێچوونی (ە)یەکیان)

رەنج دان: ڕەنج دە+ ەر= رەنجدەر

چێشت لێنان: چێت لیّ نیّ+ ەر= چێشت لێنەر (بە تێچوونی بزوێنی (یّ)، یـاخود بە تێچوونی (ە)ی ((ە ر))ە کە دەبێتە (چێشت لێنێر) بەڵام زۆر کەمـە وەکـو رێـژەی (ئاودێر، ئاودەر).

سەرنج راکێشان: سەرنج راکێش+ ەر= سەرنج راکێشەر

نان خوارن: نان خوە+ ەر= نانخوەر

کیّ هانیتی؟ لا لە رەنجدەر

چۆن هاتیت؟ بەدەردی سەر

(س. د گۆران، ل 373)

موسیقا و هەڵبەستی نەبزی دڵ یەکخەر

نیگاری بەجوانی سرنج راکێشەر

(دیوانی گۆران، ل 254)

نموونەکانی وەك (سەرنج راکێشەر، سەر سورمێنەر...) شێوەیەکی تری ناوی بکەر لـە چـاوگەکانیانەوە بـە وەرگرتنـی ڕەگـەکانیان و لابردنـی نیـشانەی چـاوگەکانیان پێکدەهێنن وەك:

سرنج راکێشان ـــــــــ سرنج راکێش

سەر سوڕمان ـــــــــ سەر سوڕمێن

نـاوی بکـەری دارِژاو: بـەهۆی پێـشگری ((بـــ))ەوە لـە ڕەگـی هـەموو چـاوگە تێپەڕەکانەوە بە ئاسایی و ناوێزەیانەوە رۆدەنرێت. لەڕووی واتاوە ئەم پێـشگرە وەکـو

(26) نووری عەلی ئەمین، رێزمانی کوردی، ل 128، 129.

پاشگری ((ندە)) (توانا و هێـز و زۆری و لێ هـاتوویی) دەگەیـەنێت. ئـەم ڕێژەیـەش لەڕووی دروستبوونەوە دوو بەشە:

ا- لە چاوگی ئاساییەوە: پێشگری ((بـ)) دەچـێتە سـەر ڕەگـی هـەموو چـاوگە ئاساییەکانەوە، یەکسەر بە لابردنـی نیـشانەی چـاوگ و پێوەلکانـدنی ئـەم پێـشگرە بەپێشی ڕەگەکانەوە وەك:

کڕین: بـ + کڕ ——— بکڕ(27)

فرۆشتن: بـ + فرۆش ——— بفرۆش

کوشتن: بـ + کوژ ——— بکوژ

کێشان: بـ + کێش ——— بکێش

چێشتن: بـ + چێژ ——— بچێژ

نووسین: بـ + نووس ——— بنووس

ناردن: بـ + بنێر ——— بنێر

زانین: بـ + زان ——— بزان

کێلاّن: بـ + کێڵ ——— بکێڵ

گۆڕین: بـ + گۆڕ ——— بگۆڕ

ڕێشتن: بـ + ڕێژ ——— بڕێژ

بڕین: بـ + بڕ ——— ببڕ

کولاّن: بـ + کوڵ ——— بکوڵ

چەند نموونەیەك:

کرد و <u>بزان</u> خۆی نازانێت

(فۆلکلۆر)

---

(27) ئەم ڕێژە ناوە بکەرییە لە لایەن مامۆسـتایانی زمانـەوان: سـەعید صـدقی، نـووری عـەلی ئەمین، جگەر خوێن، گیوی موکریانی، مەسعوود محەممەد...ەوە بەڕاستی باسکراوە و هـەر یەکـەیان چەند نموونەیەکیان لەوانەی سەرەوە هێناوەتەوە.

ببڕ و بکوژ هەر خۆیەتی

(فۆلکلۆر)

کوندەی درێژ

مەشکەی بکێش

(فۆلکلۆر)

هەتا میرزا حیکایەت خوانی میرە

مەپرسە دایە لەم کوشت و بگیرە

(نالەی جودایی، ل 88)

باسکی من و تیشکی ئەوی

بژیو دەستێنن لە زەوی

(نالەی جودایی، ل 188)

بکڕ و بفرۆش هەر خۆیەتی

کەس نییە دەس بداتە دەستی

(فۆلکلۆر)

ب- لە چاوگە ناوێزەکانەوە، ئەم ڕێژەیە، یەکسەر بەشێوەی ڕێژەی یەکەم وەرناگیرێت، بەڵکو ئەو چاوگانەی کە وەرگرتنی ڕەگەکانیان دەستووری نین بە تەنها بەهۆی پێشگیری ((بـ)) و ڕەگەکەیەوە، پێکناهێنرێت، بەڵکو بە یاریدەی پاشگری (ە ر)ەوە دروستدەبێت و ئەم ڕێژەیەش هاوبەش لەگەڵ ڕێژەی (ناوی بکەری داڕژاوی) داو وەکو (نووسەر، بخۆر، ... هتد) تێکەڵە[28]. نموونە

(28) شایانی باسە لەلایەن ئەم مامۆستایانەوە باسی ئەم ڕێژەیە کراوە:

ا- سەعید سدقی، سەرچاوەی پێشوو، ل 21.

ب- گیوی موکریانی، ئەلف و بێی کوردی وێنەدار بەتیپی لاتینی، ل 139.

ج- مەسعوود محەممەد، زاراوە سازیی پێوانە، گۆڤاری ((رۆشنبیری نوێ))، ژ 111، ل 232.

کردن: بـ + کە + ەر ــــــــــ بکەر (بە تێچوونی بزوێنی (ە)یەکیان)

خستن: بـ + خە + ەر ــــــــــ بخەر (بە هەمان هۆ)

بردن: بـ + بە + ەر ــــــــــ ببەر (بۆ سووك بوونەوە دەبێتە بەر)

خواردن: بـ + خۆ + ەر ــــــــ بخۆر/ بخۆ

دان: بـ + دە + ەر ــــــــ بدەر (هەمان هۆی سەرەوە)

لیژنەی یەکەمی دانانی کتێبی. زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی سێیەمی ناوەندی بەلایانەوە پێشگری ((بـ)) ناوی بکەری شێوەی ((بە))ش دەگرێتە خۆی، وەکو ((بەکێل، بەگەڕ)) کە لەراستیدا ((بە))ی دووەم ئامرازی پەیوەندییە و ناشێت بەو شێوەیە ناوی بکەر رۆبنێت.

هەروەها محەمەد ئەحمەد سەعید دەربارەی پێشگری ((بـ)) سەرنجێکی لەم بارەیەوە دەربڕیوە بە ((نیشانەی ((بـ))ی فرمانی داخوازی (امر ) )) داوەتە قەڵەم[30]. لەراستیدا لەڕووی واتاوە ئەو دوو پێشگری ((بـ))ی ناوی بکەری و ((بـ))ی پێشگری فرمانی داخوازی لە یەکترەوە دوورە. یەکەمیان وەکو لە پێشەوە روونمانکردەوە واتای ((توانا و زۆری و جووڵە)) دەگرێتەوە، کەچی دووەمیان واتای ((داخوازی کردن و فەرمان کردن)) دەدات، بۆ ئەو رێژە و مەبەستە[31] پێشگری ((بـ))ی ناوی بکەری لەگەڵ ڕەگی چاوگی داڕژاو و لێکدراودا بەکار نایەت، بەڵکو ((ە ر)) یا تەنها ڕەگی چاوگە داڕژاو و لێکدراوەکە شوێنی دەگرێتەوە. نموونە:

خواردن ــــــــــ بخۆر، نان خواردن ــــــــــ نانخۆر

شۆرین ــــــــ بشۆر، داشۆرین ــــــــــ داشۆر

ناتوانین بڵێین (دابشۆر).

---

د- محەمەد ئەحمەد سەعید، چەند سەرنجێکی زمانەوانی، گۆڤاری ((رۆشنبیری نوێ))، ژ 93، ل 42.

(30) محەمەد ئەحمەد سەعید، سەرچاوەی پێشوو، ل 42.

(31) سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

ئەم ڕێژەی ناوی بکەرییە، کە بەهۆی پێشگر و ڕەگی چاوگەوە پێکیدەهێنین، توانا و زۆری کارەکە لەلایەن خاوەندێوە سیفەتێکی هەمیشەییان بەخۆوە گرتووە، بەڵام بەپێی بەکارهێنان دەبنە (ناوی بکەر) و (ئاوەڵناوی بکەر)[32]. نموونە:

موگیعی ئەمرو نەهیی ئەو مولووکی سەرکەش و بزێو
ئەسیری قەهرو لوگفی ئەو سیباع و وەحشی دەشت و کێو
(بێخود، ل 4)
نەیانزانی ئەوەی ئیرەش ئەمیرە
خەریکی ڕاوو رووت و رەش بگیرە
(ناڵەی جودایی، ل 42)

ناوی بکەری داڕژاو لە ڕەگی چاوگی تێپەڕی (یائی، تائی، ئەلفی) و پێوە لکاندنی پاشگری ((یار))ەوەش[33] پێکدەهێنرێت، لەسەر ڕێژەی (کڕیار، فرۆشیار). وەك:

---

(32) بڕوانە عبدالرحمن ئەمین زەبیحی، قامووسی زمانی کوردی پیتی ((ب)) بەرگی دووەم، 1979، ل7.

(33) ا- (یار) چەند واتایەك دەبەخشێت، وەکو پاشگر بە واتای ((هاوڕێیەتی و لەگەڵ بوون)) دێت بۆ نموونە: (کڕیار، هۆشیار، هەستیار...) ئەوەیە (کڕین) و (هۆش) و (هەست)ی لەگەڵدایە. هەروەها وەکو وشەیەك دۆست و خۆشەویست دەگەیەنێت بە وێنە: یارێکم هەیە ئەڵێی بووکە/ جوانی شاری کەرکووکە... زۆر باوە و کورد دەڵێت: خوا یاربێ ئەو کارە دەکەم.
ب- بۆ ئەوەی کە ((یار)) وەکو پاشگرێك دەچێتە سەر ڕەگی فرمان نەك قەدی چاوگ، بڕوانە:
ا- زمان و ئەدەبی کوردی، بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی، ل 36.
ب- زمان و ئەدەبی کوردی، بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، ل 27.
ج- د. کامیل بەسیر ڕای وابوو کە ((یار)) بە واتای ((هاودەمێکی زۆر خۆشەویست هاتووە)) وەکو پاشگرێك بۆ بکەری و هاوڕیەتی دێت. زاراوەی کوردی ل 141.

| ناوی بکەری دارڕژاو | پاشگری (یار) | ڕەگی چاوگ | چاوگ |
|---|---|---|---|
| کڕیار | یار | کڕ | کڕین |
| سەنیار (سێنیار) | یار | سەن (سێن) | سەندن |
| نووسیار | یار | نووس | نووسین |
| فرۆشیار | یار | فرۆش | فرۆشتن |
| بەستیار | یار | بەست | بەستن |
| ژمێریار | یار | ژمێر | ژماردن |
| خوازیار | یار | خواز | خواستن |
| دانیار (بزوێنی (ێ) تێچووە | یار | دانێ | دانان |
| زانیار | یار | زان | زانین |

که لە نژیار کردنی مزگەوتەکە بوونەوە، منارە بڵندەکەی تەواوبوو.
(قەڵای دمدم، ل 49)
((... لە هەموو ناوچەکانی دەوروبەریەوە کڕیار و فرۆشیار روویان تێکرد)).
(قەڵای دمدم، ل32، 33)
ئەگەر سەنیاری خانووەکە بکڕە.

وشەی (کڕیار، فرۆشیار..) لە زمانی کوردیدا کە پاشگری (یار) یان گرتۆتە خۆ بەکارهێنانیان کۆنە و وەك لە وشەی ((رۆچیار))دایە، کە بە واتای فریشتەیە لەلای ((ئەهلی هەق)) و بە مانای رۆژیار دێت. وشەکە لە ئاڤێستادا هەیە، بەرۆژ دەڵێن ((راوچاە raocah)) کە مانای (رۆژە)ە. کەواتە پاشگری (یار) لە زمانی کوردیدا زۆر کۆنە))[34].

(34) جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، بامبێرگ، 1976، ل 57.

ئەم ڕێژەیە لە ڕواڵەتدا لە ناوی (چاوگ)ەوە زۆر نزیکە، بەڵام جیاوازی کردنی ئاسانە چ لەڕووی واتاوە و چ لەڕووی داڕشتنەوە.

ناوی چاوگ لە قەدی چاوگ و پاشگری ((ا ر))ەوە دروستدەبێت هەرچی ناوی بکەرە وەکو لە سەرەوە وتمان لە ڕەگی چاوگ و پاشگری ((یار))ەوە..

ڕۆدەنرێ لە جیاتی ئەم ((یار))ە پاشگری ((گار))یش بەکاردێت و هەمان ناوی بکەر و لەدواتر لێوەی دەدوێین، وەکو: پارێزگار.

4- لە زمانی کوردیدا ئەم ڕێژانەی (ناوی بکەر) بەدیدەکرێن:

ا- لە پەراوێزێکی تەسکداو بەشێوەیەکی کەم ئەم پاشگرانەش نـاوی بکـەری داڕژاو یا ئاوەڵناوی بکەری داڕژاو پێکدەهێنن. وەکو پاشگری (ا)

وەك: ڕەگ + پاشگر= ناوی بکەر[35] (ئاوەڵناوی بکەری داڕژاو)

زانین: زان + ا ــــــ زانا

دانان: دانێ + ا ــــــ بە تێچوونی بزوێنی (ێ) دەبێتە دانا.

توانین: توان + ا ــــــ توانا

بینین: بین + ا ــــــ بینا

((وەك زانایان گوتوویانە مێژوو ئەوەیە روو دەدا...))

(هێمن، ل 47)

زانا دانایە، دانا، توانایە.

(سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی)

ئەم جۆرانـە ئاوەڵفرمـانی (نـە، نـا)ی نـەرێ (نـەفی)یـان دەچـێتە سـەر[36] و لـە ئاوەڵناویان نزیك دەکاتەوە و ڕەوشت و تایبەتێتی یەکێك هەڵـدەگرن، کەچـی لەلایـەکی

---

(35) بڕوانە: نووری عەلی ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل 153.

(36) مامۆستایان نووری عەلی ئەمین و مەسعوود محەمەد و کوردۆییێف تـەنها هێمایـان بۆچـوونە سەری (نە)ی نەرێ کردووە کەچی (نا)ش بەکاردێت و باویشە. بڕوانە:

ا- نووری عەلی ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل 113.

ب- مەسعوود محەمەد، (ڕۆشنبیری نوێ) ژ 111، ل 234.

ترەوە پاشگری (ا) یەکیان تێدەچێت و ڕێژەیەکی دارِژاوی شێوەی نەرێ لە ڕەگی تێپەڕ و تێنەپەڕدا دروستدەکات و لەگەڵ ئاوەڵناوێکەشدا لایەنی بکەرێتی یان بەهێزتر دەبێت، لە پاشگرەکانی تر چالاکترە لە دروستکردنی ناوی بکەری دارِژاودا و[37] سیفەتی هەمیشەییانیش[38] هەیە.

وەکو: نەخۆر، نەشۆر، نەکرِ، نەفرۆش، نەزان، نابینا، نەمر، ناساز (نەساز)، نادیدە (نەدیدە).

ئەم ڕێژەیەی سەرەوە زۆر بەکار و چالاکە و تەنانەت بە یاریدەی پاشگری ((ەر))ەوەش دوای گۆڕانی هۆی دەنگسازی – لەسەرەتاوە باسمان کردووە- لە ڕەگی چاوگە ناوێزەکانەوە پێکدەهێنرێت:

بەڕاستی خەڵکێکی نەبەز و کۆڵنەدەرن.
(قەڵای دمدم، ل 355)

دەمێ بوو نادیدە دڵ بوو بوو بە پەروانەت
بەکامی خۆی گەیی بیستی کەوا شەمعی شەبوستاهات
(بێخود، ل 15)

هەموو برسی، دەغەزار
نەزان و نەخوێندەوار
(بێکەس، ل 46)

---

ج- ك. ك کوردۆییێف، سەرچاوەی پێشوو، ل 109.

(37) بڕوانە: مەسعوود محەممەد، سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

(38) ئەم ڕێژەیە لە قەدی چاوگی تێنپەڕ و تێپەڕەوە دروستدەبێت، بەڵام ئاوەڵناون وەکو ئاوەڵناوی ئاسایی بە نموونە: نەهات، نەبیست، نەبوو... بەڕای من ئەوانەی لە تێنەپەڕەوەن کورت کراوەی ڕێژەی ناوی بکەری ئاساین وەکو: (هاتوو)ە بۆتە (نەهاتوو، نەهات...) بڕوانە: کوردۆییێف هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕەی سەرەوە.

**ب-پاشکری (ندە):**

ئەم پاشگرە دەلکێتە پاشکۆی ڕەگی چەند چاوگێکەوە و (ناوی بکەری داڕژاو) و (ئاوەڵناوی بکەری داڕژاو)ی لێوە پێکدەهێنێت و مەبەستی (مەزنی و بەهێزی و زۆری و دەسەڵات و توانا دەگرێتەوە). وەك:

بەخشین: بەخش + ندە= بەخشندە

کوشندە، دڕندە، زیندە، گازندە، کەشندە...

بەم شێوەیە دەتوانین چەند نموونەیەك وەرگرین کە هەمان واتا و مەبەست دەبەخشێ، وەك: کڕندە، فڕندە، جڕندە، بڕندە)[39]، کە لە وشەسازی کوردیدا بەرچاوبگیرێت کە بە واتای توانای (زۆر کڕین، زۆر فڕین، زۆر جڕاندن، زۆر بڕین) دێن. چەند نموونەیەك:

لەم چۆڵی پڕ لە خۆلی بیابان و ڤوڵمەتە
خدری زیندە رابەری ڕێگەی خودایە غوپ
(بێخود، ل 20)

خۆی لەبەر لافاوی قینی توندی گەل راناگری
دوژمنی وەحشی و دڕندە و زاڵم و زۆرداری کورد
(هێمن، ل 124)

دڵم سەد هێندی دێکانە بەناز بشکێنی دەنگ ناکەم
چ سودێکی هەیە؟ کێیە بپرسێ داد و گازندە
(ناڵەی جودایی، ل 26)

با جار جارێ دڕندەییێك
لە برسانا کوشندەییێك
(دیلان، ل 233)

مەڵێ ڕێگەی کەشندە، یا کوشندە ئەژدەرە، یاخو

(39) بڕوانە: زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی، ل 36.

کەمەندە، یا طە نابی خێوەتی گەردوونی گەردانە

(نالی، ل 491)

**ج- پاشگری ((ۆك)):**

ئەم پاشگرە چالاكە لە دروستكردنی (ناوی بكەری دارِژاو- ئاوەڵناوی بكەری دارِژاو)دا لە ڕەگی چاوگی (تێنەپەڕ و تێپەڕی) (لە تێپەڕكراویش بە ((ا ندن)) ئەلفی- یائی- دالی- تائی بەكەمی) ئەمانەش دەبنە دوو بەشەوە:

1- لە چاوگی گوێزانەوەوە:

نموونە بۆ ئەو چاوگانەی ناوی بكەر دروستدەكەن وەكو:

گەڕان: گەڕێ + ۆك ـــــــ بەتێچوونی (ێ) دەبێتە گەڕۆك.

سازان: ساز + ۆك ـــــــ سازۆك

فڕین: فڕ + ۆك ـــــــ، فڕۆك

خشان: خش (خشێ + ۆك ـــــــ خشۆك (بزوێنی (ێ) تێچووە)

بزووتن: بزوو + ۆك ـــــــ بزۆك (بزوێنی (وو) تێچووە)

چەند نموونەیەك:

لە یەكەم تا شەشەم خشۆكی ژاردارە

حەوت و شەش لەگەڵ دوو كراسی رەشمارە

(دیوانی گۆران، ل 534)

وەكو من بوو گەڕۆك و بێ خانی

دەنگێكی لەرزۆك و نەرم بەسپایی جوابی دامەوە

(حاجی قادر، ل 217)

گەڕۆك شارەزای چاكە.

پیاوی گەڕۆك هەمیشە بگەڕە.

## 2- له چاوگی روودانەوە:

لەم جۆرە چاوگانەوە پاشگری (ۆك) ئاوەڵناوی بکەری دارِژاو پێکدەهێنن، چونکە بکەرەکانیان دیار نییە پاشان سیفەتێکی بەردەوامیان گرتۆتەخۆ. وەکو:

لەرزین: لەرز + ۆك ـــــــــ لەرزۆك

دزین: دز + ۆك ـــــــ دزۆك

پسان: پسێ + ۆك ـــــــ پسۆك (بە تێچوونی بزوێنی (ێ)

برژان: برژێ + ۆك ـــــــ برژۆك (هەمان هۆی سەرەوە)

پاشگری ((ۆك)) لەرِووی واتا و مەبەستەوە (سووکی و نزمی) دەبەخشێت.

ئەم رێژەیە لە بەتێپەرِ کراوەکانیشەوە، وەکو واتاو دروست بوونیش وەردەگیرێن و لەگەڵ رێژەکەدا خۆیان دەنگونجێنن، بەڵام بەکارهێنانیان دەگمەنە و تەنها لەرووی دەستوورەوەن:

سازدان: سازێن + ۆك ـــــ سازینۆك

رژاندن: رژێن + ۆك ـــــــ رژینۆك

پساندن: پسێن + ۆك ـــــــــ پسێنۆك... هتد

((نۆك)) ئەم پاشگرەش بە هەمان واتا و مەبەستی ((ۆك)) دێت، بەڵام (ئاوەڵناوی بکەری دارِژاو) بەهۆیەوە وەردەگیرێت.

وەك: گرینۆك، ترسنۆك... منالّی گرینۆك باوك و دایکی وەرِس دەکات.

((دەنا ئەوی ترسنۆك بەرتیلی دەدا تفەنگی لێ وەرگرن)).

(هێمن، ل 18)

هەی ترسنۆك هەی بێ ورە

پیاو بە، دان بەخۆتا بگرە

(س. د گۆران، ل 284)

پاشگری ((ە ك)):

ئـەم پاشـگرە لـە ڕێژەیـەکی تەسـك و کەمـدا (نـاوی بکـەری داڕژاو)ی لێـوە وەردەگیرێت[40] و لە ڕۆنانی تریشدا بەشدار دەبێ وەك (ناوی ئامێر)دا:

ڕووان: ڕوێ + ە ك ـــــــ ڕووەك (بە تێچوونی بزوێنی (ێ))

نووسان: نووسێ + ە ك ـــــ نووسەك (هەمان هۆی سەرەوە)

دزین: دز + ەك ـــــــــ دزەك

<u>ڕووەکی</u> خۆڕسك لە کوردستان زۆرە.

<u>نووسەك</u> ڕووەکێکی دڕکاوییە.

د- پاشگری ((ە، ەوار، گار، یدە)):

ئەم پاشگرانەش (ناوی بکەری داڕژاو) بەکەمی ڕۆدەنێن:

پاشگری ((ە)) لە قەدی چاوگەوە زۆر بەکەمی ناوی بکەر پێکدەهێنێت:

خواردن: خوارد + ە ـــــــ خواردە

دیتن: دیت + ە ـــــــــــ دیتە (دیدە)... هتد

پاشگری ((ەوار))

خوێندن: خوێند + ەوار ـــــــــ خوێندەوار

پاشگری ((گار)) ئەم پاشگرە ((پاراستن و ئاگاداری)) دەگەێنێت وەکو:

پاراستن: پارێز + گار ـــــ پارێزگار، کردگار ... هتد

---

(40) لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ لە ل 247ی (ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی)دا ئەم ڕێژەیـە بـە ئاوەڵناوی ناو دەبات، بەڵام ڕاستیێکەی ناوی بکەری داڕژاوە، بە تایبەتی (ڕووەك) کە ناوی داڕژاوە و گومانی لەسەر نییە نابێتە ئاوەڵناوی بکەری داڕژاو.

((یدە)): ناوی بکەری داڕژاو و ئاوەڵناوی بکەری داڕژاو لـە ڕەگـی چـاوگەوە زۆر بەکەمی دروسـتدەکات ئـەم پاشـگرە وەکـو ((ۆك)) ((سـووکی و نزمـی و کـەمی)) دەبەخشێت:

گەران: گەرێ + یدە ـــــــ گەریدە (بزوێنی (ێ) سووك بۆتەوە بووە بە (ی)

تەرین (تاران): تەری + یدە ـــــــ تەریدە

گەزین: گەز + یدە ـــــــ گەزیدە

ئەی گوڵی ژاڵە لە گوێی چەم پایزان

ڕەنگت سورمە ڕێژە بۆ دیدە کزان

(دیلان، ل 384)

نەخوێندەواربوو، بەڵام داستانی

خوێندەوارانیش نرخیان ئەزانی

(دیوانی گۆران، ل 528)

بە گریانی وشك، بە ناڵەی بێ دەنگ

دێنمە لەرزین تەختی کردگار

(فرمێسکی نهێنی، ل130)

قەباڵەی عیسا و ئەحمەدی موختار

پارێزگارم بن لە دوو توێی مەزار

(پیرەمێرد، ل 167)

چییە گوناە و تاوانم

تەریدەم جەردەی کاروانم

(تاریك و روون، ل 226)

خولاصە نێوی نبووەت لە پاش ریسالەتی تۆ

میثالی مار گەزییدەی مولەققبە بەسەلیم

(حاجی قادر، ل 82)

ناوی بکەری دارِژاو گەلێك شێوەی دروستبوونی تری هەیە وەك:

1- لە ڕەگی چاوگی دارِژاوی تێپەڕەوە بەلادانی نیشانەی چاوگەکانی و هەندێکیانیش کە ناوێزەن پێشگر و پاشگریش بەشداری تێدا دەکەن. بەڵام ئاساییەکانیان تەنها بە وەرگرتنی ڕەگەکانیان رۆدەنرێن وەك:

هەڵگرتن: هەڵگر، هەڵپاچین: هەڵپاچ، داپاچ، لێزان — هەڵگیر، وەرگێڕ.

ناوێزەکان: لێخواردن: لێخۆ + ەر ——— لێخۆر[41] (دەنگی (ە) تێچووە)

داخستن: داخە + ەر ——— داخەر

تێکردن: تێکە + ەر ——— تێکەر

تێ خستن: تێخە + ەر ——— تێخەر

لێنان: لێنێ + ەر ——— لێنەر

هەڵکردن: هەڵکە + ەر ——— هەڵکەر

لێدان: لێدە + ەر ——— لێدەر

مشتە تۆوی دانەویڵەی چاکە شکنابەم، کەچی
دائیمەن هەڵگێڕ و وەرگێڕی ئەکەم وەردی گوناح
(بێخود، ل 22)

رێگر و حیزو دزە، ژن هەڵگر و مالان بڕە
فائیدەی چی نێوو کونیەی خۆی موسڵمان دادەنێ
(حاجی قادر، ل 179)

پێشگری ((تێ)) بە واتای ((چوونە ناوەوە)) و ((پێ)) بە واتای پێوە لکان و پێوە نووسان دێت.

2- هەندێ ناوی بکەری دارِژاو هەن دەتوانرێ لەسەر رێژەی (بزوێن) دابنرێن و رۆبنرێن[42]، بەڵام بە تەنها بەکارنایەن، ئەگەر وشەیەکی تر نەخرێتە پاڵیانەوە وەك:

---

(41) بڕوانە: ا- رێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ل 249.

ب- گیوی موکریانی سەرچاوەی پێشوو، ل 149 ئەم رێژەیەیان بێ روون کردنەوە بەکارهێنراوە.

پسێن، رمێن، کولێن، سورێن، خولێن، بژوێن، رزێن، خنکێن، جۆشێن، تەقێن، شکێن.

بژوێنە هەموو ولاّت
زیندوو بۆتەوە مالاّت
(تاریك و روون، ل 105)
ئاگر قورقۆشم، غازی خنکێن
ئەداتە دەستی و پڕ لە جوێن
(دیوانی گۆران، ل 196)

ناوی بکەری لێکدراو:

ئەم جۆرانە بریتین لە وشەیەکی واتادار و ڕەگ یان قەدی چاوگی تێپەڕ – بە تێپەڕ کراویشەوە- و تێنەپەڕەوە. ئەگەر چی ئەم ڕەگانە واتاکانیان روون نین، بەلاّم بنەمای پاراستنی واتای چاوگ و فرمانەکانن و دەبنە هۆی مانەوەی واتاکانیان و دەورێکی چاك و گرنگ و کاریگەر دەبینن لە کێشەی وشەسازی (مۆرفۆلۆجی)دا بەتایبەتی لە پێکهاتنی وشەدا. جا ئەو دەورە بۆ ئەم دەگەڕێتەوە نەك بۆ ئەو ناو و وشە واتادارانەی لەگەلێدان. لەبەر ئەوەی ڕەگی چاوگەکە لەڕووی واتا و دروستبوونی وشە تازەکانەوە بەهێزترە بۆیە واتای وشەکەی تەکیەوە پەلەکێش دەکات بۆ واتا و مەبەستی تازە، بە شێوەی لێکدراوی... ((لەوانەیە بلێین کەواتە بۆچی پێی دەگوترێت فرمانی (چاوگی) ناسادە یان بۆچی بۆ فرمانەکەیە نەك بۆ ئەو وشانە؟ لە وەلاّمدا دەلێین چونکە فرمان (چاوگ)ە، دەگۆڕێتەوە و دەوری ئەو وشانە واتا تازەکانیان دەخاتەڕوو و ئەوان وەك خۆیان دەمێننەوە هەرچەندە بەبێ ئەوان ئەو واتا تازانە دروستنابن))[43].

(42) بڕوانە: بیروڕای مامۆستا مەسعوود محەممەد لە گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ))دا ژمارەی پێشوو، ل 24. بەڕای من تەنها (بزوێن، بژوێن) واتادارن.

(43) بڕوانە: د. نەسرین فەخری و د. کوردستان موکریانی، ڕێزمانی کوردی ل 129.

کەواتە ئێستا دەتوانین (ناوی بکەری لێکدراو) وەکو دارِژاوەکەی بگەرِێنینەوە بۆ چاوگ. سەرەرِای ئەوەی کە زمانی کوردی بەهۆی چاوگ و رِەگەکانیەوە ژمارەیەکی بێ ئەندازە وشە و زاراوەی لێوە وەردەگیرێت. بەهۆی ((... وشە و ئامراز و پێشگر و پاشگر و هی تریشەوە هەر دەچێتە ژێر خانەی دارِشتن))ەوە[44]، ئەگەرچی زمانی کوردی لە زمانە لێکدراوەکانیشە.

ئەمجا ناوی بکەری لێکدراو ئەم جۆرانەی هەیە:

ا- لە ناوێك و رِەگی چاوگ، دوای لابردنی نیشانەی چاوگەکە ناوی بکەری لێکدراو پێکدێت، وەکو:

سەرتاشین: سەرتاش، پیاوکوشتن: پیاوکوژ

پەیام نێر، جل شۆرین: جل شۆر، دار فرۆشتن: دار فرۆش، دانساز، چەخماخ ساز، زنجیر پسێن، لەش مرێن... بەم پێیە ئەم ناوە بکەرانەش وەردەگیرێن:

کوتاڵ فرۆش، دارتاش، کارێزکەن، ماسیگر، کاکێش، کۆڵ هەڵگر. (لە وشەیەکی واتادار و رِەگی دارِژاو پێکهاتوون)، رەنجکێش، رەنجدەر، بلوێر ژەن، خوێنمژ، مووچە خۆر، نانکەر، پیلان گێرِ، ئارام گر، جغارەکێش، قژ هەڵپاچ، نیشتمان فرۆش، بزن مژ، نانکرِ، نانخۆر...

زەمبیل فرۆش پادشا بوو رۆژێکی سوار بوو، چووە راوێ.

(تحفه مظفریه، ل 308)

بانگبێژ جارِچی خواو دوژمنی خەو.

(رشتەی مرواری، ل 58)

زورِنا ژەن کە برسی بوو بیری کفتەی شایی ئەکا.

(پەندی پێشینان، ل 88)

تا سالیکی مە سالیکی مولکی قەناعەتی

---

(44) عەبدول رەزاق بیمار، زاراوەکانی ناو کتێبانی قوتابخانە، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ 111، بەغدا، 1986، ل 294.

باکت نەبێ لە ڕێگر و ئەهلی شەقاوەتی
(حاجی قادر، ل 157)
پۆل پۆل ئافرەت، شیردۆشی جوان
ئەکشێ بۆ ناو ڕان
(گۆڕان، ل50)
خەم ڕەوێنێك لێرە من ناکەم بەدی
چۆن پەنا بۆ مەی نەبەم، ساقی ئەدی
(ناڵەی جودایی، ل 19)

ب- ناوی بکەری لێکدراو لە ناوێك و قەدی چاوگی تێنەپەڕ و تێپەڕ بەهۆی پاشگری (و، وو) یا تەنها لە ناوێك و قەدەکەیان بە مەرجێك ناوەکەی پێشیان دەوری بەرکاری وەرگرتبێت پێکدێن[45]. ئەم ڕێژەیە خۆی لە خۆیدا دەبێتە ئاوەڵناو بەشێوەی لێکدراوی، بێ بەکارهێنان، چونکە پێکهاتنێکی وەسفی هەیە، هەروەها دەبێتە ناویش:

کۆست کەوتن: کۆست کەوت + وو ـــــــ کۆست کەوتوو

باوك مردوو، دڵ ڕەنجاو، جەرگ سووتاو، بار کردوو، سەرکەوتوو، مال بردوو، پەرۆ سووتاو، منالْ خنکاو، نێچیر کوشتوو، پەرۆسوتاندوو دۆکولێو (دۆکولاو)، یەکگرتوو، ماڵشێواو.

ئەی فریشتەی شیعری جوان
کۆستی کەوتووی هەردووکمان
(گۆران، ل 83)
قاورمە لەجێی گۆشتدا ئەنرا

(45) بڕوانە: ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ل 254.

به کەشك تامەزرۆی دۆکولێو ئەدرا

(پیرەمێرد، ل 272)

ئەیەویٚ ئازاد، یەك گرتوو

بژی نەك وەك کوردی نوستوو

(گۆران، ل 240)

شاعیر ماڵ شێواو، بۆ دژ داماوی

کیژی، خەو ئاڵووی، شێتی خەرفاوی؟

(تاریك و روون، ل 76)

جـ- هەموو چاوگێکی تێپەڕ بێجگە لەوانەی کە بە (اندن) دەکرێن بە تێپەڕ دوو ڕێژەی ناوی بکەری لێکدراویان هەیە[46]. یەکەمیان لە وشەیەکی واتادار و ڕەگەکەی پێکدیٚ. دووەمیان لە هەمان وشەی واتادار و ڕێژەی ناوی بەرکاری داڕژاو — واتە قەدی چاوگ و پاشگری (وو)، وەك:

نانبەر ـــــــــ نان بردوو

هەواڵ نێر ـــــــــ هەواڵ ناردوو

گۆشت خۆر ـــــــ گۆشت خواردوو

ئاو رژێن ـــــــ ئاو ڕژاندوو

جل دڕێن ـــــــ جل دڕاندوو

جل شۆر ـــــــ جل شۆردوو

د- ئاوەڵفرمانی شوێنی بە تایبەتی ((لا، بەر)) لە دروستکردنی ناوی بکەری لێکدراودا بەکارە کە لەگەڵ ڕەگی چاوگی تێپەڕدا دێت. دەگمەنیشە لەگەڵ تێنەپەڕدا و بەکارهێنانیانیش کەمە:

---

(46) بڕوانە: مەسعوود محەممەد، چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی ل 47-48.

لاگرتن: لا + گر ـــــــــ لاگر، لابڕ، لادڕ، لادەر، لاخۆر، لابەر، لاکوت، لامژ، بەرگر، بەرهەڵست، بنگر، بەرچن، بەرچێن، بەرکێش، بەرمژ...

ئەم ڕێژەیەی ناوی بکەر دەچێتە ژێر (ناوی بکەری لێکدراو) بەڵام بەجیا باسکردنی لەبەر ئەوەیە، کە تایبەتە بە ئاوەڵفرمان و ڕەگی چاوگ تێکەڵیش دەبن لەگەڵ (ناوی بەرکار)دا، بەتایبەتی (بەر)[47] ئەگەر لەگەڵ فرمانەکەدا روویان یەکبێت، ئەگەریش دژی رووەکەی بێت (دژی اتجاهی) ئەوا ناوی بکەرە:

لاگری سوڵحە تەواو ڕەنجبەری وشیاری کورد
چاوە نۆری دەرفەتێکە خەڵکی لادێ و شاری کورد
(تاریك و روون، ل 122)

بەرچەمی سوور و سپی و سەوزی ئەمە
شادی هێنە لابەری دەرد و خەمە
(تاریك و روون، ل68)

ئەندامی لەشی مرۆڤ و ڕەنگەکان و ئاوەڵناو لە کوردیدا (سەر، گوێ)ی لێ دەربچێت لەگەڵ ڕەگی چاوگ و چەند قەدێکدا ئاوەڵناوی بکەری لێکدراو پێکدەهێنن، بەڵام لەگەڵ (گوێ)دا ناوی بکەر. بۆ نموونە:

گوتم ئەی مەلی دلسووتاو
چییە، بۆ دەناڵی بەتاو
(تاریك و روون، ل 119)

وێڕای تەقەی دەسڕێژی دەستەی ئاگر
دیوەزمەی ڕەش دەیگوت و پێ دەکەنی
(تاریك و روون، ل 179)

تابڵێی تەڕپۆش، ئاڵ و واڵا جل

(47) بڕوانە: رێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ل 256.

بەژن و باڵاجوان، بەدەن نەرم و شل
(گۆران، ل 133)
قەومی کورد ئیسپاتی کرد بۆ عالەمی سەر ڕووی زەمین
میللەتێکی قارەمانن هەر ئەبێ سەربەست بژین
(بێکەس، ل 158)
دەنگ بڵاوە خەڵق ئەڵێن ئەمجارە کورد سەربەست ئەبێ
چی ئەڵێن بیڵێن، لەلام وایە درۆ و چاو بەست ئەبێ
(بێکەس، ل 71)
گوتی: ئەی شاعیرە گەش بینەکە بۆ ڕەشبینی
گوتم: ئەی ناسکە تەڕپۆشەکە بۆ ڕەشپۆشی
(ناڵەی جودایی، ل 25)

**تایبەتێتییەکانی ناوی بکەر:**

ناوی بکەر چەند تایبەتێتییەکی هەیە و بۆ مەبەست و واتای تر بەکار دەهێنرێ، وەکو:

1- ناوی بکەر کە لە چاوگەوە وەردەگیرێ وەکو چاوگ بەناو بەکاردێت و واتای کرداری (پرۆسیس- عملیە)ی چاوگەکەی هەڵدەگرێت و وەکو ئەویش بەپێچەوانەی فرمانەوە کاتیان تێدا بەدیناکرێت واتە ((.. ئەم سیغەیەش کەسدار نییە، یەعنی ناتوانێ لەپێشەوە یەکێ لە بۆ ناوە کەسیەکان کە ئەبنە باسلێکراو (فاعل) وەرگرێ...))(48).

(48) بڕوانە: ا- تەوفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، ل 26.
ب- زمان و ئەدەبی کوردی، بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی، ل 20.

2- دەبنە زاراوە و ئیدیەم[49] و خوازە، هەروەها هەندێ ڕیژەی بە تایبەتی ئەوانەی لێکدراون و (لە ناوێك و ڕەگی چاوگی یا ڕەگ و پاشگری (ۆك) پێکهاتوون) دەبنە ناوی ئامێریش، وەکو: نووسەر، داهێنەر، لێکۆڵیار، تێکۆشەر، ڕێگر، مەلا بەزێن، قنگ لێکەوتوو، دڵبەر، گێرەشێوێن، ڕەشبین، لێکۆڵەوەر، پێوەر، بڕۆك، لادەر، گەڕۆك، مژۆك، پێبڕ، پستۆك، دەسکێش، دووربین:

لە سەقزو لە بۆکان شین و شەپۆڕە و گریان
تێکۆشەر لە دار دران قارەمان لە ناوبران
(تاریك و روون، ل100)

ئەو کاغەزەم لە بۆ بەرە
بیدە بەدەستی دڵبەرە
(تحفەء مظفریە، ل 350)

یەکێك بووە مارگر و یەك بوو بە دەروێش
یەکێك بووە حافز و یەك بوو بە دەسکێش
(ناڵەی جودایی، ل70)

خوێن ڕێژ و شەڕەنگێز و عەد و بەند و تەن و مەند
کامیان کە گەدە شێرە لە مەیدانی مەسافا
(شێخ ڕەزا، ل 453)

---

(49) بڕوانە: ئیبراهیم ئەمین باڵدار، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژ 112، 1986، ل 212، ئەم جۆرە ڕێژانەی (ناوی بکەر)ی بە زاراوە داناوە کە لەڕاستیدا هەر واشە. هەروەها مامۆستا محەممەد مەعروف فەتاح بۆ ئەوە چووە کە هەندێك ناوی بکەر دەبنە ئیدیەم. لێرەدا لەوەی سەرەوە زیاتری لەسەر ناڕۆین، چونکە بابەتەکە پەیوەندە بە واتا ناسێوە (سمانتیك Symantic)، کە هەریەکەیان دوو زانستی سەربەخۆن و لە یەکتر جیاوازن، بەڵام بەپێی پەیوەندی بە باسەکە مانەوە ئاوڕمان لێدایەوە. بڕوانە محەممەد مەعروف فەتاح دیسان ئیدیەم لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق، ژ 15، بەغدا، 1986، ل 94-95.

3- ناوی بکەر پیشە و کار و تایبەتێتی یەکێك یا خاوەنەکەی دەگەیەنێت و بەپێی ڕەسەنەیاتی[(50)] ناوی بکەر ئەم بەشانەی لێدەبێتەوە:

ا- ناوی بکەر بۆ پیشەی نێر: دارتاش، ئاسنگر، ئاودێر، کاکێش، سەرتاش، کارێزکەن، ماسیگر، نانبەر، سەرباز، قازان پاکەر، ڕاوکەر...

گادەبم بەنۆکەر و گا گادەبم بە شوانە

(تحفەء مظفریە، ل 293)

ب- ناوی بکەری پیشەی مێ: تێلەکێش، مەڵۆنێر، نانکەر، جلشۆر، شیردۆش، مانگادۆش، تەشی ڕێس، گارەکەر.

لەوێ بێزار بوو ئینسانی بە نامووس

تەشی ڕێس بوو لە دەرکی ئەو زمان لووس

(ناڵەی جودایی، ل 54)

پاڵە بە مرە مرە

تێلەکێش مەمکی خرە

(فۆلکلۆر، کۆکراوە)

هەر لە دێوە تاناو ڕان

بەلەنجە دێن شیردۆشی جوان

(گۆران، ل 51، 52)

جـ- ناوی بکەر بۆ پیشەی دوو لایەن: نووسەر، پارێزەر، ڕابەر، کۆڵکێش، کۆڵهەلگر، چێشتکەر، سواڵکەر، دەرۆزەکەر، دارکەر.

---

(50) بڕوانە: ا- ك. ك. کوردۆییێف، سەرچاوەی پێشوو، ل 72، کە ناوی پیشەی تەنها بە یەك خاڵ باس کردووە و جیایانی نەکردۆتەوە.

ب- د. ئەوڕەحمان حاجی مارف، سەرچاوەی پێشوو، ل 168-169 ناوی پیشەیی بەپێی نێر و مێ و دوولایەن جیاکردۆتەوە، بەڵام بێ ئەوەی ناوی (ناوی بکەر) بهێنێ.

4- ناوی بکەر لەم چەند ساڵانەی دواییدا بەزۆری و بەفراوانی بۆ ناوی تایبەتی کەس بەکارهێنراوە. وەك: دانا، زانا، توانا، هەڵکەوت، سەرکەوت، ڕێبین، ڕابەر، ڕێبەر، سەربەست... هتد کە لە چاوگەوە وەرگیراون.

هەڵکەوت قوتابی یەکی ژیرە

ڕێبەر و ڕێبین هاوڕێی یەکترن

5- ناوی بکەر لە ڕووی بەکارهێنانەوە ناوی بکەر وەکو ناویش و ئاوەڵناویش لە ئاخاوتن و نووسیندا بەکاردێت، وەکو ناو ئەرك و تایبەتێتییەکانی ناو لەڕووی دەورێوە لەڕستەدا دەبینێ واتە نیشانەی تاك و کۆ و نیشانەی ناسراو و نەناسراو وەردەگرێت، وەك:

پڕ لە دانیشتووی ناوخۆ

لە دڵشاد و ڕەنجەرۆ

(ع. ح. ب، ل 32)

((... دانشتووەکان هەموو چاو زیت ئەکەنەوە...))

(سەجادی، کوردەواری، ل343)

هێزی لاو یەك بگرێ بۆ ئاشتی دنیا

شەڕ فرۆش مەگەر قوڕ بکا بەسەریا

(س. د گۆران، ل 255)

وەکو ئاوەڵناویش بەکار دەهێنرێت ئەگەر ببێتە تەواوکەری ناوێك یا راناوێك و سفەتیان هەڵبدات[51]، وەك:

میوەی گەیشتووی زەرد و سووری باخ

جریوە و جوکەی دارستانی شاخ

(گۆران، ل 9)

هەزاران کاوەی زەحمەتکێش

---

(51) بڕوانە: ا- نووری عەلی ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل 131.

ب- زمان و ئەدەبی کوردی، بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، ل 32.

پاڵ پێوە بنێ بەرەو پێش

(تاریك و روون، ل 160)

((پیاوی زانا و خوێندەوار و وشیار و تێ گەیشتوشیان دەنێودا هەبوون))

(قەلای دمدم، ل 35)

سوپای نوستوو ئەشکێنن

تۆڵەیان لێ ئەستێنن

(ع. ح. ب، ل 81)

دڵ شاهینی دیدە بازە مەستی شەرابی نازە

دڵدار و دڵنەوازە، دڵکێش و دڵفڕێنە

(نالی، ل 396)

6- ناوی بکەر پاشگری ((ی)) واتایی (ئەبستراکتی – Abstract) وەردەگرێ و لە مەبەست و واتای پێشووی دوور دەکەوێتەوە و دەبێتە ناوی واتایی وەك: میللەت فرۆشی، خوێنمژی، سەربەستی، نیشتمان فرۆشی، ئاسنگەری[52]:

سەری ڕاهاتووی، تاجی سەربەستی

کەی ئەنەوێ بۆ زیندان پەرستی

(دیوانی گۆران، ل 187)

ئەگەر میللەت نەکا میللەت فرۆشی

لە خۆی نابینێ زاڵم خێرو خۆشی

(ناڵەی جودایی، ل 69)

7- هەندێ ڕێژەی لێکدراوی بەهۆی پاشگری (ە)وە دەبێتە ناوی فەرهەنگی وەك: ئەسپێ کوژە.

---

(52) بڕوانە: د. فاروق عومەر سدیق، وشەسازی لە زمانی کوردیدا، لە ب 2، ب3 (گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد) دەرهێنراوە، بەغدا، 975، ل505. لەم ڕێژە ناوە ئەبستراکتییە دواوە، بێ ئەوەی ناوی بکەر بهێنێت، بەڵام نموونەکانی زۆری ناوی بکەر و پیشە و کار دەگەیەنن.

## بابەتی دووەم

## ناوی بەرکار (اسم المفعول- Participle)

ناوی بەرکار: ناوێکی گشتییە لە چاوگەوە وەردەگیرێ و بکەرەکەی تێدا بەدی ناکرێت و رووداوەکەی دەکەوێتە سەر و بەهۆی واتا و بەردەوامی کردەوە کەوتووەکەی سەری، بۆی بۆتە سیفەت و دۆخێکی (حاڵەتێکی)[53] هەمیشەیی، کەس و کاتیانیشی تێدا نییە.

**بنەواشەکانی پێکهاتنی ناوی بەرکار:**

ناوی بەرکار وەکو بنەواشەیەك بە پێچەوانەی ناوی بکەر و هەموو بابەتەکانی ترەوە بەگشتی لە قەدی چاوگەوە وەردەگیرێت. کەچی ناوی بکەر ئەوانی تر تەنها رێژەیەك یا لە ناوێزەکاندا نەبێت هەر لە ڕەگی چاوگەوە رۆدەنرێن.

تائێستا دوو هەوڵی لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ و وتارێکی ئەم دوایەی مامۆستا نووری عەلی ئەمین نەبێت، تەنها یەك رێژەی ناوی بەرکاریان، ئەوەی کە لە قەدی چاوگی نادیارەوەیە باسکردووە[54].

---

(53) بۆ ئەم پێناسەیە سوودم لە پێناسەی لیژنەی دووەمی دانانی کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی بینیوە، هەروەها چەند سەرچاوەیەك دەربارەی (علم الصرف)ی عارەبیم سەیر کردووە کە لە بەشی یەکەمی ئەم باسەدا ناوم هێناون.

(54) بڕوانە: ا- لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ، رێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ل 252- 253.

ب- نووری عەلی ئەمین، گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە 111، ل 170.

**1- ناوی بەرکاری دارِژاو:**

1- بنەواشەی یەکەم: ناوی بەرکار بنەواشەیەکی هەیە زۆر بلاو و بەکارهێنراوە، کە لە قەدی چاوگی تێپەڕی نادیارەوە وەردەگیرێ، لەبنەڕەتدا تێپەڕەو بەهۆی پاشگری ((را))ی نادیارێوە دەکرێ بەتێنەپەڕ، وەکو: کوشتن: کوژ + را + ن ———— کوژران

ا- بەلادانی نوونی چاوگی نادیاری و پێوەلکاندنی پاشگری (و)ی بەرکاری بۆ سەر قەدە نادیارەکە، ناوی بەرکاری دروستدەکرێ بەم پێیە لە قەدی چاوگی نادیاری تێپەڕ و بە تێپەڕ کراوەوە بەهۆی ((اندن))ەوە- دەتوانرێ ناوی بەرکاری لە قەدی هەموو ئەم جۆرانەوە وەربگیرێت، ئەمجا چاوگەکە سادە بێت یان دارِژاو.

کوژران: کوژرا + و ———— کوژراو

سوتان: سوتێنران — سوتێنرا + و ———— سوتێنراو، سراو، بوراو، تاشراو، خنکێنراو، برژێنراو، ناسراو، هەلکراو، بەستراو، پەستراو، نێراو، گیراو، گوشراو.

ئەگەر هاتو رێکەوت ئەو چاوگانەی ڕەگەکانیان ((کە لە پێش حرفان (یادتو) ((واتە پیتەکانی نیشانەی چاوگ)وە (ر)بوو وەکو (کردن، بردن، خواردن، کڕین) بۆ خاتری دوو (ر) کۆ نەبنەوە (ر)ی ئەداتە کە فڕێ دەدرێ))[55]، وەکو بڕین بڕراو، کڕراو، سڕراو، جڕراو، دڕاو... هتد.

ئەم چاوگانە هەندێکیان ناوێزەیان تێدایە لە وەرگرتنی ڕەگەکانیاندا کە ((را))ی نادیاری وەردەگرن دەنگی کۆتایی ڕەگەکانیان دەتوێتەوە و قەدی نادیاری و ناوی بەرکاری دروستدەبێت، وەك: دان، بردن، خستن، کردن... کە بەم شێوەیە ناوی بەرکارییان لێوە ساز دەبێت:

---

جـ- لێژنەی یەکەمی کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی، 1972 باسی رێژەی تری کردووە بەلام نارێك و تێکەلە، ل 30.

(55) سەعید صدقی، مختصر صرف و نحوی کوردی، ل 23. هەروەها لە هەندێ شێوە زاری کوردیدا وەکو هەولێر، رەواندز، کۆیە، دەوترێ بڕدرا، کڕدار، خسترا...

دان: ده + را + و ـــــــــ دراو (به نەمانی (ە))

بردن: به + را+ و ـــــــــ براو (هەمان هۆ)

خستن: خه + را+ و ـــــــــ خراو (هەمان هۆ)

کردن: که + را+ و ـــــــــ کراو (هەمان هۆ)

له شاعیری زمان بڕاو

له شاعیری دەفتەر دڕاو

(تاریك و روون، ل 157)

بێشکەی منالێ ئاگر تیێ بەردان بەسه

ئەتۆم کڕین بەدراوی نان بەسه

(گۆران، ل 415)

بووکی دنیا وەك دەڵێن وابێ حەیاو بێ فەڕ نەبوو

هێندە دامەن هەڵکراو و حیزو ماڵان گەر نەبوو

(حاجی قادر، ل 104)

ئەم ڕێژەیەی سەرەوە له هەموو چاوگەکانەوە ڕۆدەنرێت، بەڵام بۆ چاوگە (واوی)یەکان لەجیاتی (ر)ی نادیاری دەتوانێ (و) وەرگرێت.

وەکو: گروون ـــــــــ گروووراو، گرواو. بەڵام لەسەر زمان دووەمیان سوکتر و لەبارترە بۆ دەربڕین. هەروەها (جواو) له (جوین)ەوەیە.

ب- شێوە لێکدراوەکەی ئەم ڕێژەیە هەمان پێکهاتنە، بەڵام له پێش داڕژاوەکەیەوە وشەیەکی واتادار که بەزۆری ناوە لەگەڵیدا دێت و دەیکات بەلێکدراو، بەڵام لەڕووی واتاو دروستبوونەوە دەکەوێتە ژێر رکێفی قەدی چاوگەکە. هەروەکو له سەرەوەی ئەم بەشەدا هێمامان بۆ کرد و روونمان کردەوە قەدەکە چالاکتر و بەزاخترە بۆ پێکهاتنی وشە تازەکە.

وەکو: باوك کوژراو، جەرگ بڕاو، نان خوراو، پیّ لیّ خراو، کلیل دراو، دۆبڕاو، دڵ بەستراو، چاکراو، چاو بەستراو، بەشخوراو، ماڵ سوتێنراو، ماڵ دزراو، خانوو روخێنراو، نان خوراو، داگیر کراو...

دوانزە مانگ لە یار بڕاویّ
دوانزە مانگ بۆ یار گریاویّ
(گۆران، ل 23)

ئەم رێژە لێکدراوییە بەزۆری رووی لە واتاوە دەبێتە ئاوەڵناو و سیفەتی خاوەنەکانیان هەڵدەگرن.

## 2- بنەواشەی دووەم:

ا- ناوی بەرکار لە قەدی چاوگی روودانەوە پاشگری (و) ئەگەر (ئەلفی و یائی) بن و واویش وەکو خۆی دەمێنێتەوە. ئەم رێژەیە بکەرەکانیان دیار نییە، چونکە رووادانیان لەخۆیەوە نابێت و دەبێت هێزێك هەبێت بۆ رووادانیان، کەواتە دەبنە (ناوی بەرکار)، نەك (ناوی بکەر) وەکو باوە[56]، وەك: مردوو، رزاو، سووتاو، ڕژاو، تۆپیو، خنکاو، پساو، رووخاو، شکاو، سواو، قۆپاو، کولاّو:

تا ئەو زیاتر داگیر کراو
بداتە بەر کەڵبەی سواو
(دیوانی گۆران، ل 49)
پشت دارڕزاوی قەمچی دارکاری
رووەمەت قوپاوی ئاخی هەژاری
(دیلان، ل 81)

---

(56) تائێستا ئەم رێژەیە بەکارتێکردنی زمانی عارەبی لەلایەن زمانەوانی کوردەوە بە (ناوی بکەر) دانراوە لەگەڵ ناوی بکەری چاوگی گوێزانەوە تێکەڵکراوە بە (ناوی بەرکار)یان زانیوە، بە تەواوی جیا نەکراوەتەوە.

((برۆ مردووت مرێ بمره بۆ خۆت))

(رشتەی مرواری، ل 93)

ئێستری زیندوو، بلێم، بۆم چاکە، یا مردووم دەوێ

ئیحتیاجیم زۆرە خانم با بلێم هەردووم دەوێ

(دیوانی شێخ ڕەزا، ل77)

بۆ وەرزی تازەی گەردن سوور گرتوو

نەورۆز... نێرگسی ئەکرد بە سووتوو

(دیلان، ل 328)

ب- بەهەمان ڕێژەی لقی (ا) ڕێژەیەکی تر هەیە لە قەدی چاوگی تێپەڕەوە بە یارمەتی پاشگری (وو —و) دادەڕێژرێت، بەڵام بەکارهێنانی زۆر کەمە، وەك:

کوشتن: کوشت + وو ———— کوشتوو، بردوو، خستوو، کیلاو، هێناو، دیو... هتد.

ئەم ڕێژەیە ئەگەر وشەیەکی واتاداری (ناو) بچێتە پێشەوەی لە دەوری بکەردا ڕێژەکە دەگۆڕێت بە (ناوی بەرکاری لێکدراو) ((واتە ئەگەر بدرێتە دەم بکەرەکانیانەوە))(57).

وەك: گورگ خواردوو، دزبردوو، ئاوخنکاندوو، کرم کوشتوو

دەخاتە گەردەنی ئێمە میپالی دابەستوو

گوریسەکەی بەڵەکی صوبح وشام و ناترسین

(حاجی قادر، ل 96)

دەمە و بەهار کەوتۆتە دووی

کڵاوی تۆفی با بردووی

(دیلان، ل 251)

---

(57) بڕوانە: ا- زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، ل 38.

ب- لێژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کوردی، ل 254.

ئەڵێی سەگی کرم کوشتوو وایە
(لە دەم خەڵکێوە)
ئەگەر لە دەوری بەرکاریشدا بێت ئەوا لە ناوی بەرکاری دارِژاوەوە دەی گۆرِێت بە (ناوی بکەری لێکدراو)، وەك:
کارکردوو، بەشخواردوو، پیاو کوشتوو، گۆشتخواردوو، نێرککردوو،
وتت ئێمەی گرِی شەرِدیو
بە کۆمەڵ لە خاکا رزیو
(دیلان، ل 66)
ناکامی ئەیام کامەرانیم رِۆ
بەرنەخواردووی زیندەکانیم رۆ
(پیرەمێرد، ل 315)
ئەم رێژەیەی سەرەوە کەمن بە وشەی مردوو (جامد- ناودەبرێن لەبەر زۆر بەکارهێنانیان لەکاتی خۆیدا بەر لێشاوی گۆرِینی زمانەکە کەوتوون. ئەم رێژەیە چەند وشەیەکی کەمی لێ بەکاردێت وەکو: (کردوو، خستوو، بردوو) ژمارەیان زۆر نییە، بەڵام وەکو دەستوور لە چاوگەکانەوە دروستدەبن، بەڵام بەکارهێنانیان زۆر کەمە و تەنها ئەو ژمارە کەمەن ئەوانەش یا بەکارتێکردنی زمانێکی تر وەکو (زمانی فارسی)[58].
بەشی دووەمی نموونەکانی رێژەکەی سەرەوە کە بەهۆی ناوە بەرکارەکەی پێشیانەوە بوونەتە (ناوی بکەری لێکدراو) جیاوازی لەگەڵ ئەو ناوە بکەرانەی لەگەڵ چاوگی لێکدراوەوە پێکدێن، هەیە. وەکو: پیاوکوژ، سەرتاش، گۆشتخۆر، پەنجەرەشکێن، ئەمانە سیفەتێکی هەمیشەیی و بەردەوامیان گرتۆتە خۆیان، بەڵام

(58) دکتۆر وریا عومەر ئەمین لە رۆژی 1987/10/27 لە بەغدا لە کۆلێجی پەروەردە- بەشی کوردی لە بارەی ئەم جۆرەی ناوی بەرکارێوە، ئەوەی بۆ روون کردمەوە.

ڕێژەکەی سەرەوە، وەکو (پیاو کوشتوو، گۆشتخواردوو، پەنجەرە شکاندوو) سیفەتێکی کاتییان هەیە[59].

بنەواشەی سێیەم: ناوی بەرکاری جۆرە ڕێژەیەکی هەیە لە قەدی چاوگی تێپەڕ پاش لادانی نوونی چاوگەکەی و پێوە لکاندنی پاشگری ((ە)) پێکدێت. ئەم پاشگرە بەکار و بەهێزە و دەورێکی یەکجار چالاك دەبینێ لە وشەسازی کوردیدا و وشەی تازە و جۆر بەجۆر دەهێنێتە ناو فەرهەنگی زمانی کوردییەوە، کە بۆ واتاو مەبەستی تازە بەکاردەهێنرێت لە داڕشتن و لێکدانی زمانی کوردیدا[60]. بۆ ناوی بەرکار لە چاوگی سادە و داڕژاو و لێکدراوەوە، وەك:

کوشتن: کوشت + ە= کوشتە

بەستن: بەست +ە= بەستە

لەسەر ئەم شێوەیە ناوی بەرکاری داڕژاو بەزۆری لە چاوگی (تائی و دالی)، هەروەها بەکەمیش لە قەدی (یائی، ئەلفی) دروستدەبێ، ئەم ڕێژەیە لە دەقە کۆنەکاندا زۆر بەکارهاتووە، بەڵام لای ڕێزمان نووسان تازەیە[61].

خستە، کردە، پۆشتە، بردە، نیشتە، هەڵاتە، پاراستە، خواستە، ڕەهەندە، ناردە، سپاردە، پەستاوتە، بژاردە، هەڵبەستە، گرتە، هەڵگرتە، چاوبەستە، کارکردە، داخستە، راسپاردە، بڕیە، شێلە، بەرهاویشتە، قەول و بڕیە، زگەدڕیە.

کردەی ئەوە و بردەی شەماڵ.

(پەندی پێشینان، ل112)

بە حەقی جەوری هەیاسەی زەڕ و کاکۆڵی سەری

دڵی گوم گەشتەیی من کوشتە بێ پشت و کەمەرە

---

(59) بڕوانە: لێژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کوردی، سەرچاوەی پێشوو، ل 55.

(60) بڕوانە: نووری عەلی ئەمین، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژ 111، ل 169.

(61) بۆ ئەم ڕێژەیە بڕوانە: ا- پەراوێزی (55) هەمان سەرچاوە، ل 252، 253.

ب- پەراوێزی (55، ب) ل 170. هەردوو سەرچاوەکە باسی ڕێژەکەیان کردووە.

(نالی، ل 414)

خەڵکی دنیا ڕازی دڵداری بەبێ تەل پێك دەڵێن

ڕاسپاردەی لاو و کیژی کوردە ئێستاکەش شنە

(تاریك و ڕوون، ل 69)

وەحی ئەو بەند و باسەم

کردە و کۆشە و کاسەم

(دیلان، ل58)

بنەواشەی چوارەم: هەندێ ناوی بەرکار لە ئاوەڵفرمانی شوێنێوە، بەتایبەتی (بەر، بن) لەگەڵ ڕەگی چاوگی تێپەڕ و تێنەپەڕ دروستدەکرێن، بەڵام (بەر) نزمایی دەگەیەنێ و بەمەرجێك ((لەگەڵ کارەکە یەك ئیتجاهیان هەبێت))[62]: بەرکوت، بەرپرس، بەرکوڵ، بەرکەن، بن کێڵ، ... هتد.

ئەم ڕێژەیە لەڕووی پێکهاتنەوە لێکدراوە.

((فەرموو، جارێ بەرکوڵێکی بکەن، تاقلیانە شوانەکە پێدەگا)).

(قەڵای دمدم، ل 67)

تایبەتییەکانی ناوی بەرکار

1- ناوی بەرکار وەکو ناوێکی گشتی بەکاردێت لە نووسین و ئاخاوتنی کوردیدا وەك:

((ڕەنگە تۆ وا بزانیت من نووسراوت بۆ ئەنێرم وەك هەموو چەشنە نووسراوێك))

(ڕۆژی نوێ، ل 25)

2- ناوی بەرکار توانای وەرگرتنی ئاوەڵفرمانی (نە)ی هەیە.

وەك: نەبڕاو، نەخواردوو، نەسووتاو، نەبرژاو.

---

(62) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو کە لە پەراوێزی (54)دایە، ل 256.

دوور و درێژی ڕێگەی تێکۆشان
وەچەی نەمردووی کاوەی قارەمان
(دیلان، ل 330)

3- لەڕووی بەکارهێنانەوە دەبێتە ناو و بەکارهێنانی بەو چەشنەیە، کە لە خـاڵی یەکەمدا خستەڕوو، بەڵام کـە بـووە تەواوکـەری ناوێـك یـا ڕاناوێـك ئەوکاتـە وەکـو ئاوەڵناوێك لە ئاخاوتن و نووسیندا بەکارە[63]، وەك:

مریشکی برسی ئاشی ئاوبردوو لە خەوا ئەبینێ.
(پەندی پێشینان، ل 128)

بە جووت هەردوو باوك کوژراو
تك تك.. خەمان تکا لەچاو
(گۆران، ل320)

4- وەکو ناوی ئاسایی دەبێتە تاك و کۆ و نیشانەی ناسراو نەناسراو وەردەگرێـت. وەکو ئاوەڵناویش پلەکانی بەراورد (تر، ترین) وەردەگرێت.

بەداخی باوك کوژراوان
بە هەنیسکی هەتیو باران
(ناڵەی جودایی، ل 33)

لە ماڵی ناسراوەکە یا نانو ماست ئەخوا
(ڕشتەی مرواری، ل 89)

زیندوو هات بەفێڵ مردوویەکی ناشت
بەری دارەکەی ئادەمی لێ ناشت
(پیرەمێرد، ل 440)

(63) بڕوانە: نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، ل31.

5- دەبنە ئیدیەم وەکو: دۆبڕاو، سەرلێ شێواو، دڵبەستراو، شول لێ هەڵکێشراو، چاوبەستراو، دڵبڕاو.

سەر لێ شێواو

وەك نێچیری رێ لێتەنراو

(دیلان، ل311)

لە هەق بێزار و دڵ بەستەی ریایی

یەکەم تۆ چینی کێڵگەی بێ وەفایی

(نالەی جودایی، ل 54)

6- دەبێـە زاراوە، وەکو: هەڵبژاردە، راسپاردە، پاشەکەوت.

((راسپاردەی باب و باپیرانە دەبێ ئەو نیشتمانە بپارێزین...)).

(قەڵای دمدم، ل 75)

پاشکەوتی جۆ بەکەم مەژمێرە

خواردنی چوار پێ و دوو پێیە لێرە

(پیرەمێرد، ل 216)

کردەم بردەی کۆمپانی بوو:

هەم ڕەنجم چوو هەم نەوتم چوو

(گۆران، ل 273)

## بابەتی سێیەم

## ناوی چاوگ (اسم المصدر: Noun Action)

ناوی چاوگ ئەو ناوانەن کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن و واتای تەواوی چاوگەکانیان هەڵدەگرن، بەڵام وەك چاوگ رووداو و کردنیان تێدا نییە[64] و بەهۆی واتایانەوە دەزانرێ ناون و بوونی سەربەخۆیان نییە و لەشتی تردا هەن. لەم رووەوە لەناوی واتایی نزیکدەبنەوە. بۆیە پێی دەوترێ (ناوی چاوگ) چونکە لە چاوگەوە وەردەگیرێ.

بنەواشەکانی داڕشتنی ناوی چاوگ

ناوی چاوگ بە چەند رێگایەك رۆدەنرێ:

**1- بنەواشەی یەکەم:** هەندێ ناوی چاوگ لە قەدی چاوگ و پاشگری (ا ر) لە چاوگی (تائی، دالی، یائی، واوی، ئەلفیش بەکەمی) پێکدێن. ((بە زۆریش ئەم (ار)ە لەگەڵ تێپەڕدا دێت))[65]. پاشگری (ار) لە تێپەڕەوە ناوی چاوگ و لە تێنەپەڕەوە ئاوەڵناو پێکدەهێنێت، وەك (مردار). ئەم رێژەیەی ناوی چاوگ (یائێکانی) لە ناوی بکەری رێژەی (کڕیار) دەچێت، بەڵام لە قەدی چاوگەوە دروستدەبێت، هەرچی ناوی بکەرەکەیە لە ڕەگ و پاشگری (یار)ەوە.

| چاوگ | قەدی چاوگ | پاشگری | ناوی چاوگ |
|---|---|---|---|
| پرسین | پرسی | ار | پرسیار |
| دزین | دزی | ار | دزیار |
| کوشتن | کوشت | ار | کوشتار |
| کردن | کرد | ار | کردار |

(64) رێزمانی ئاخاوتنی کوردی، 258.

(65) مەسعوود محەمەد، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ 111، ل 228.

بەپێی ئەم ڕێژەیەی سەرەوە وەکو دەستوورێك ئەم وشانەش هەن، وەکو: بڕیار، ناسیار، وتار، کە لە چاوگی (بڕین، ناسین، وتن)ەوە وەرگیراون.

لەم ڕێژەوە دەتوانرێ بەپێوانە وەکو دەستوورێك ئەم ناوە چاوگانەی لێوە وەرگیرێن: بەستار، پەستار، دروار، مشتار، رستار، دیدار (دیتار)

دروار رێکە، بەستاری، مەحکەمە، مشتاری شیرینە[66].

من لەناو (جاما) بە دیدار شاد ئەبم

هەر بۆنی گیان و دڵ ئازاد ئەبم

(دیلان، ل387)

((ئەوە ماوەیەکی زۆرە لە دیداریان بێ بەشم..))

(تاریك و روون، ل 26)

**بنەواشەی دووەم:**

ناوی چاوگ جۆرێکی تری هەیە، کە لە ڕەگی تێپەڕ و تێنەپەڕ و پاشگری ((ە))ەوە پێکدەهێنرێت، وەك:

| چاوگ | ڕەگی چاوگ | پاشگر | ناوی چاوگ |
|---|---|---|---|
| نالێن | ناڵ | ە | ناڵە |
| کۆکین | کۆك | ە | کۆکە |
| کێشان | کێش | ە | کێشە |
| دزین | دز | ە | دزە[67] |
| پرسین | پرس | ە | پرسە |

(66) رۆشنبیری نوێ ژ (111) ل 228 ئەشێ وەکو دەستوور رۆبنرێن.

(67) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ل 260.

بەپێی ئەم شێوە دروستبوونە، ئەم ناوە چاوگانەش لە زمانی کوردیدا هەن و لە گفتوگۆ و نووسیندا بەکارن وەکو: جمە، خشە، کڕە، لەرزە، فڕە (لە فڕینەوە)، هێڵە (لەهێشتن)، چەشە (لەچێشتنەوە)، ژمارە (ژمێرە) لە (ژماردن)ەوە.

تەمز خەڵقی دێ لەسەر فرمانن
خەریکی کێشە و شەن و خەرمانن
(دیوانی گۆران، ل 142)

ئاشتی کتك و مشك پرسەی بەقاڵە
(پەندی پێشینان، ل11)

تا لە مەکتەب ئەو مەهەم دی مەشقی ئەلف و بێ دەکا
چاوەکەم بوویتە دوێت و گریە سورخی تێ دەکا
(حاجی قادر، ل 46)

مەقالاتی جوان عیلمی ژمارە
بۆ هونەری ئەو یەك هەزارە
(نەجمەدین مەلا، رۆژی نوێ، ژ (7)، ل 69)

ئەم رێژەیە بەوە لە (ناوی بەرکار)ی وەك (کوشتە، گرتە) جیا دەکرێتەوە کە:

یەکەم- ئەم رێژەیەی (ناوی چاوگ) لە ڕەگی چاوگەکەی و پاشگری ((ە)) پێکهاتووە، لە حالێکدا ئەم شێوە ناوە بەرکارەی سەرەوە لە قەدی چاوگ و پاشگری ((ە))ەوە دروستدەبێت.

دووەم- ئەم جۆرە (ناوی چاوگ)ەی سەرەوە لە تێنەپەڕ و تێپەڕەوە وەردەگیرێت، کەچی ئەو شێوەیەی (ناوی بەرکار) تەنها لە قەدی تێپەڕەوە رۆدەنرێت.

ئەم شێوە پێکهێنانەی ناوە چاوگییەی سەرەوە لەو دەنگە سروشتییانەشەوە بەرچاو دەکەون کە بوونەتە ڕەگی چاوگە بەتێنەپەڕ کراوەکانیان وەکو:

باڕاندن: باڕە، نالاّندن: نالّە، هەروەها شیڕە، زرمە، گرمە، حیلـە، هـاژە، خرتـە، کرتە، جریوە، هاڕە، چرکە، نرکە، جووکە، قاڕە، باڕە، بۆڕە، جۆش، خرۆش... هتد.

گرتمانە دەس (مەشخەڵ) بۆڕێ

لەو نرکەی تۆپانەی کەدێ

(دیوانی گۆران، ل 440)

خۆش خۆشیتە کراسەکەت چیتە

بەزیڕە بمری چ واعدەی شویتە

(فۆلکلۆری دەسنووس)

ئەم دەنگە سروشتیانە لـە زمـانی کوردیـدا وا دەرەکـەوێت لـە سـەرەتای پەیـدا بوونیانەوە (ئاوەڵنـاو) بـووبن و وەسـفی دەنگـی خاوەنـەکانیان کردبێـت یـا دەنگـی دیاردەیەکی سروشتی وەك (باران، با، ئاو...) یا هـی ئاژەڵیـان نیـشان دابـێ وەکـو: دەنگی بۆڕ، دەنگی خرت، دەنگی قیڕ، دەنگی فیك، دەنگی جیك، کە هی (مانگـا و مشك و بۆق و دەنگی مرۆڤ و هی بەچکە پەلەوەر) بن، ئەمجا سـەربەخۆ بوونەتـە نـاو بەهۆی پاشگری ((ە))ەوە- کە ئاوەڵناو دەکاتە ناو وەکو: بۆڕە، قیڕە، خرتە، فیکە... هتد، پاشـان لەلایـەن مرۆڤـەوە شـێوەی چـاوگ و فرمانەکەشـیان وەکـو (بۆڕانـدن- بۆڕاندی) گرتۆتە خۆیان. نموونە:

(ئازادی دگان گڕ: گڕ: ئاوەڵناوە)

**بنەواشەی سێیەم:**

لەڕەگی چاوگی تێپەڕ و تێنەپـەڕی (یـائی، تـائی، ئـەلفی)یـەوەش بـە لابردنـی نیشانەی چاوگ وەردەگیرێت[68].

وەك: دزین ـــ دز، پرسین ـــ پرس، خەوتن ـــ خەو، سووڕان ـــ سووڕ، ترسان ـــ ترس، ترشان ـــ ترش، بڕین ـــ بڕ، کۆشین ـــ کۆش، کێشان ـــ

(68) ئەم ڕێژەیە لە هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل 260 و هەروەها زمان و ئـەدەبی کـوردی پـۆلی سێیەمی ناوەندی، ل 33 بەکەمی و بێ ڕوونکردنەوە باسکراوە.

کێش، ڕۆیشتن ـــــ ڕەو، مژین ـــ مژ، کش لە (کشانەوە)، چەشتن (چێشتن) ـــــ چەش (چێژ)، دڕین ـــــ دڕ، ئێشان ـــــ ئێش، گیران ـــــ گیر... هتد.

بەناڵەی بەکوڵ بەگریان
بەسینك کوتان، بەڕوو ڕنین
(ناڵەی جودایی، ل 34)

قەولم دابەتۆ وام زانی مەردی
نەمزانی بۆمن هەر ئێش و دەردی
(فۆلکلۆر، دەسنووس)

نیازی وایە چاو سووری شەڕ
ئاشی پیلان بخاتە گەڕ
(دیلان، ل 66)

(حاجی) وەك دڵ تۆ بەگریە بەشوێنی مەکەوە
ئاسکێکە بە بەزین و بەهەرا نایەتە گیر
(حاجی قادر، ل 65)

ئەی نەتەوەی کاوەی زنجیرە قەف قەف بڕ
ڕۆژی نەورۆز دای بە هەوری زستان دڕ
(گۆران، ل 309)

**بنەواشەی چوارەم:**

هەندێ (ناوی چاوگ) هەیە لە ڕەگی چەند چاوگێکی تێپەڕ و تێنەپەڕەوە بە یارمەتی پاشگری (ست، شت، ش)[69] ەوە وەردەگیرێن، وەکو:

بڕین: بڕ + شت ـــــــ بڕشت

---

(69) ئەم ڕێژەیە لە کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی سێیەمی ناوەندی، 1970، ل 32. هەروەها لێژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕەوە، سەرچاوەی پێشوو، ل 260. باسکراوە، بەلام تەنها بەسێ چوار نموونە و بێ لێدوان.

کۆشین: کۆش + ش ـــــ کۆشش (کۆششت- ئەمەیان کەمە)

زانین: زان + ست ـــــــ زانست یا لە (زانستن)ەوە

بەم پێیە ئەمانەش دروستدەبن وەکو: خورشت، ڕەوشت، جۆشش، خارشت، ئاڵشت (لە – ئالآنەوە)، گەردش ( لـە گەردانـەوە)، سـپارش، پەرسـتش، درشـت، بڕسـت، بەخشش، توانست.

روخاندی گەردشی گەردون لە هەرجێ ئاستانێ بوو
سوتاندی چەرخی دوون پەروەر لە هەر کوێ ئاشیانێ بوو
(شێخ ڕەزا، ل33)

ئێستاکە لە پاش بووردنی شەش ساڵە بەعەودەت
دڵشادم و تۆ دەم دەم ئەکەی پرسشی حاڵم
(گۆران، ب، ل49)

رۆژی پڕ لە زانست، پڕ لە فەننی جوان
کتێب، رۆژنامە، هەیکەل و مەیدان
(گۆران، ل 190)

دێم هەتا هەمبێ بڕست و بیرو هۆش
گەر گلاشم، کوردەواری و ئێوە خۆش
(ناڵەی جودایی، ل 24)

هەر جوگە و جۆباری کەوا سوور و سوێربێ
جێی جۆششی گریانی منە خوێن نەڕژاوە
(نالی، 55)

هەندێك شێوەی تری (ناوی چاوگ) هەیە، کە جۆر بەجۆرن و کـەمن و بەدەگمـەن لەسەرچاوە رێزمانییە کوردێکاندا ناویان بە ناوی چاوگ هێنراوە بەڵام لەڕووی واتـاوە دیارە کە واتایەکی روونی چاوگەکەیان دەدەن و کات و رووداویشیان تێدا نییە، وەکو:

(کردەوە) لـە (کـردن)ەوە، هـەروەها پەڕینـەوە، کڕینـەوە، سـڕینەوە، چـوونەوە، بڕینەوە، هەروەها خۆراك، پۆشاك، خواردەمەنی، خواستەمەنی.

کەڵکی بۆ خۆی و بەشەربێ، خادیمی راستی وەتەن
های و هۆیی بێ سەمەر هەر کردەوەی شێتانەیە
(بێکەس، ل 38)
رۆژی پڕ لە خۆراك بۆ گیان و بۆ لەش
رۆژی پڕ لە ئافرەت، پڕ لە باغچەی گەش
(گۆران، ل 190)

**تایبەتییەکانی ناوی چاوگ**

**ناوی چاوگ ئەم تایبەتییانەی خوارەوە دەگرێتە خۆی:**

1- ناوی چاوگ وەکو ناوێکی ئاسایی بەکاردەهێنرێت و نیشانەی ناسراو و نەناسراوی وەردەگرێت، بەڵام (ان)ی کۆکردنەوە وەرناگرێ، چونکە نابێتە کۆ و خۆی چەمکی دەبەخشێ و وەکو ناوێکی گشتی وایە. بۆ نموونە: کوشتارەکە لەکێشا نەبوو. کوشتاریان لە دوژمن کرد. کوشتارەکە دوایی نایەت. بەڵام ناتوانین بڵێین (کوشتاران، پرسیاران، خەوان، کۆکان، کەچی لەگەڵ (ەکە)دا کۆدەکرێتەوە وەکو: پرسیارەکان، خەوەکان.

2- ناوی چاوگ دەبێتە زاراوە، وەکو: کوشتار، بڕیار، زانست، وتار... هتد.

پەردە و تارای سوور بەرن بۆ ئەمیر
بڵێن پاش کوشتار هێشتا تۆی دڵگیر
(پیرەمێرد، ل 102)
رەواجی کوانێ لای خەڵقی وتار و شیعری پڕ مەعنا
گەلێ کەس پێکەنینی دێ بە گوفتار و دەم و لەوسم
(بێکەس، ل 139)

3- ناوی چاوگ ڕێژەکەی کە لە تێنەپەڕەوە وەردەگیرێت دەبێتە ئاوەڵناو، وەکو: مردار، بەڵام بە پاشگری (ی) دەبێتەوە (ناو)، وەکو (مرداری).

بۆ قەسابییەك بزنێك مردار مەکەرەوە.

(پەندی پێشینان، ل29)

4- ناوی چاوگ (ی) واتایی (ئەبستراکتی) وەرناگرێت، چونکە خۆی چەمکی واتایی دەبینێ، بە پێچەوانەی ناوی بکەرەوە کە بە (ی) واتایی دەبێتە (ناوی واتایی). هەرچەندە وشەی وا هەیە کە (ناوی بکەر)ە، وەکو (زانیار) بە (ی) دەبێتە ناوی واتایی، بەڵام کراوەتە (ناوی چاوگ)[70].

دەتوانین بڵێین (میللەت فرۆشی، کڕیاری، فرۆشیاری، زانیاری) ناتوانین بڵێین (کوشتاری، خەوی ... هتد). ناوی چاوگ لەبەر ئەوەی لە چاوگەوە وەردەگیرێت جیاوازە لە ناوی واتایی.

5- هەندێ ڕێژەی ناوی چاوگ ئەگەرچی وەرگیراوە و لە چاوگیشەوە وەردەگیرێ، بەڵام لەڕووی پێکهاتنەوە بە سادە دادەنرێ، وەکو ئەوانەی تەنها لەڕەگی چاوگەوەن وەکو: پرس، خەو، ترس... هتد.

6- نابنە ئیدیەم، چونکە شێوەی پێکهاتنی لێکدراو و فرەیزو... یان نییە، تەنها سادە و داڕژاون. وەکو: وتار، بڕیار، خەو، کۆشش، ناڵە... هتد.

7- ناوی چاوگ جیاوازە لە چاوگ، چونکە چاوگ یەك ڕێژەی دیاری هەیە و واتای ڕوودان و کردنی تێدایە، بەڵام ناوی چاوگ تەنها واتای چاوگەکەی هەڵدەگرێت نەك لەڕووی کردارەوە (عملیە، پرۆسێس).

---

(70) لێژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری، بەلایەوە ناوی چاوگ شێوەی لێکدراوی هەیە وەکو (پەلەفڕە، بوومە لەرزە، جێ گۆڕکە، سەرسووڕکە، چاوشارکێ، هەڵپەڕکێ) بەڵام لەراستیدا ئەوانە ناوی فەرهەنگی و هەندێکیانیش (ناوی یارین) کە بابەتێکی تایبەتین و جیاوازن لە ناوی چاوگەوە، بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل 261.

## «بابەتی چوارەم»
## ناوی جێگا (اسم المکان- Locative)

ناوی جێگا ئەو ناوانەن کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن و شوێنی روودانــی فرمــان لــە ئیش و کارێکی تایبەتییدا دیاری دەکەن و تایبەتن بە ئیشێکی دیاری کراوەوە نەك بۆ زۆر شت.

بۆ نموونە: ڕوانگە: شوێنی روودانی سەیرکردن و ڕوانینی تایبەتییە تەنها بــۆ ئــەو ئیشە. بەڵام ئەو ناوە جێگایانەی کە لە ناوەوە پێکدەهێنرێن، بە پێچەوانەی ئەوانــەی لە فرمانەوەن بۆ شوێنی گشتین و ئیش و کاری جۆر بەجۆر و جیاواز لەیــەکتری تیــادا دەکرێت.

ناوی جێگا لە زمانی کوردیدا بەهۆی پاشگری ((گە، گا، ە ن))ەوە دروستدەبێت، بەڵام ((گــە)) لــە هــەر هــەموویان چالاکترە. بێجگــە لــەوەش (گــە، گــا) لــەڕووی بەکارهێنانەوە جیاوازیان هەیە ((گــە)) زیــاتر گونجــاو و لــەبار و موســیقی تــرە بــۆ پێکهێنانی ناوی جێگا لــە چــاوگەوە، چــونکە لــە دەربڕینــدا ســوکترە، وەك: جمگــە، ڕوانگە، فڕگە، سپرگە. کەچی ((گا)) لەگەڵ (ناوی جێگا) کە لە ناوەوە پێکدەهێنرێت گونجــاو و ســوکترە. وەکــو: ســەربازگا، ئوردووگــا، لەشــکرگا، ســەیرانگا... کەچــی (ڕوانگا، فڕگا، سپارگا، خولگا، پرسگا، ئاوڕووگا... هتــد لەســەر زمانــدا ناڕێــك و قورسە.

مامۆستا جەمال نەبەز پێشنیاری کردووە ((.. لە زمانی کوردیی ئەدەبیــدا هــەر تەنیا پاشگری ((گە)) بەکار بهێنرێ باشــترە))[71] بــێ ئــەوەی ئــەم جیاوازییــە روون بکاتەوە.

---

(71) جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، ل 63.

**بنەواشەکانی دارشتنی ناوی جێگا:**

1- بە زۆری لە ڕەگی چاوگی تێپەڕ و تێنەپەڕی گوێزانەوەدا بە پێوەلکاندنی پاشگری ((گە)) بە کۆتاییەوە ناوی جێگای دیاری کراو دروستدەکات:

| چاوگ | ڕەگ | پاشگر | ناوی جێگا |
|---|---|---|---|
| جمین | جم | گە | جمگە |
| کێلان | کێڵ | گە | کێڵگە |

بەم پێیە ئەمانەش پێکدەهێنرێن ئاورۆگە، سازگە، ڕوانگە، فرۆشگە، خولگە، پارێزگە، گیرگە، پەڕگە، سپارگە (سپێرگە، سپرگە)، پرسگە، پاڵێوگە، گەوزگە، رێژگە، خزگە، شۆرگە، خەوگە، سووڕگە، رێسگە (رێستن)، هەڵدێرگە (هەڵدێر، لە هەڵدێرانەوە)، بارگە (لە بارینەوە). حەسێنگە (حەسانەوە)، شارگە (لە شاردنەوە — حەشارگە).

فرمانێك.. قەی ناکا قورسیش بێ بەشانم
لەژێریا لێك دەرچێ گشت جومگەی ئێسقانم
(دیوانی گۆران، ل 200)

ئاشقی کیژێکی بومە
ماریان وا لە پەڕگەیە
(فۆلکلۆر، ل 157)

تەدارەکەم دەگرت، بارگە وبنە، چەندم رەنگین دەکردنەوە نۆکەرە.
(تحفەء مظفریە، ل 280)

ئەوی تریان خەریکە هەڵدەوێژێری لە کێڵگەی بەرد
یەکێك ماڵوو دەگایەك دادەچێنێ تازەشینا وەرد
(تاریك و روون، ل60)

2- هەندێ ناوی جێگا هەن بە کەمی لە تێنەپەڕ و تێپەڕ بەلادانی نیشانەی چاوگەکەیان و لکاندنی پاشگری (ە ن، ێن) یا لە ڕەگی چاوگی بە تێپەڕ کراو بەهۆی (اندن)ەوە، وەردەگیرێن. وەك:

ڕێشتن (ڕشتن): ڕێژ + ەن ـــــــ (ڕێژەن)[72]

سووتان: سووتێ + ەن ـــــــ سووتەن (بەتێچوونی بزوێنی (ێ)ی ڕەگی چاوگەکەی.

رووتانەوە: رووتێ + ەن ـــــــ رووتەن (بە هەمان هۆ)

چەقاندن: چەقێن

بوژانەوە: بوژێ + وێن ـــــــ بوژوێن ((بژوێن) هەمان هۆ)

بەستان: بەست + ێن ـــــــ بەستێن

کڕاندن: کڕێن

شەقاوی ئاسك و ڕەوتی لەڕووتەن
لەگەڵ یەك تێکەڵ و پێکەڵ ئەبینی
(دیلان، ل 341)

ئاو هەڵدێر، خوڕێن، گۆمی مەند
کێڵگە، بەیار، بژوێن، زەمەند
(تاریك و روون، ل 223)

دێم بەرە و لێر و چڕو بەستێن چۆم
دێم بەرە و بژوێن و زەنوێر و زەمەند
(ناڵەی جودایی، ل 23)

---

(72) لێژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ، سەرچاوەی پێشوو، ل 263. بێ لێدوان تەنها سێ نموونەیان خستۆتەڕوو.

ڕێژەی تر هەیە کە لە چاوگی داڕژاوی تێپەڕ و تێنەپەڕەوە بەلادانی نیشانی چاوگ و دوای هەندێ گۆڕان و دەنگ سوانەوە، پێکدێن و بەکەمیش هەن بۆ (ناوی جێگـا)، وەکو:

هەڵدێران: هەڵدێر، کەندن ـــــــ کەند، هەروەها (بنکە) لـە (بـن کەنـدن)ەوە، کەندن: کەند + ەڵان ـــ کەندەڵان.

ئاودز لە (ئاودزین)ەوە هاتووە.

هەروەکو وشـەی (دەسـتاڕ، جۆمـاڵ) کـە لـە بنـەڕەتی خۆیـان (دەسـت هـاڕین، جۆگەماڵین)ن دوور کەوتوونەتەوە و چەند دەنگێك لێیانەوە سواوە و تێچووە، ئەمجا ئەم شێوەیەی کە ئێستا هەیانە، بۆ سووکی و دەربڕین و گفتوگۆیە لە زمانەکـەدا. وەکـو دیاردەیەکی گشتی هەموو زمانەکانی جیهان لە سەرەتای پەیدابوونیانەوە وشـەکانیان بریتیی بووە لە کەرتی درێژ و گران و پاشان وردە وردە لەگەڵ پێشکەوتنی زمانەکـەدا لە پەرەسەندندا بەرە و کورت کردنەوە و سوکی و ئاسانی هاتووە[73]. نموونە:

گەڕان کێو و چیاو ئەشکەوت و زەندۆڵ
گەڕان کادێن و کەندوو و ئاخوڕو هۆڵ
(ناڵەی جودایی، ل 86)

ڕێگە سەخت و پڕ لە کەند و هەڵدێرە و گەورە
هەردەبێ ببزووم، دەبێ بکشێم، وچانی نەدەم
(ناڵەی جودایی، ل 37)

مەنفەز و درز و ئاودزی هەرچەند
دەیگرم، دەیکوتم، بەدەست و بەپێ
(دیوانی شێخ ڕەزا، ل 52)

---

(73) مستەفا قەرەداغی – سالار، زمان چییە؟ و چۆن پەیدا بووە؟ چاپخانەی کامەران، سلێمانی، 1958، ل 18.

ڕێژەیەکی کەم بەکارهێنراو هەیە لە قەدی چاوگەوە بە یارمەتی پاشگری (گە، گا، مان، خانە) ناوی جێگە پێکدەهێنێت وەکو ڕێژەی (پەرستگا):

خوێندن: خوێند + گە ـــــــ خوێندگە

زانستن: زانست + گە ـــــــ زانستگە (زانستگا)

نیشتن: نیشت + مان ـــــــ نیشتمان

گرتن: گرتوو (ناوی بەرکارە) + خانە ـــــــ گرتووخانە

**تایبەتییەکانی ناوی جێگا:**

ناوی جێگا ئەم تایبەتییانەی هەیە:

1- وەکو ناوێکی ئاسایی وایە، بەڵام بەوە جیا دەکرێتەوە کە شوێنی ڕوودانی فرمان پیشان ئەدات بۆ کار و کردەوەیەك.

لە کۆشك و گرتووخانە دەرکە بەستە
یەکێك مەستە، هەزاران زار و خەستە
(ناڵەی جودایی، ل 92)

2- نیشانەی ناسراو و نەناسراوی وەردەگرێت. وەك: فرۆشگە، فرۆشگەیەك، جمگە، جمگەکە: ئازاد جمگەکەی شکاوە، بەڵام بەکارهێنانی کەمە لە دەقەکاندا.

3- کۆدەکردێتەوە، بەڵام زیاتر لەگەڵ نیشانەی ناسراوی (ە کە)دا چالاکترە، وەك: فرۆشگایان، فرۆشگاکان، فرۆشگەکان، لەگەڵ (ان)دا کە دەگۆڕێت بە ((گا)) هەروەها ڕوانگە ـــــــ ڕوانگایان، ڕوانگەکان، پارێزگە، پارێزگاکان، پارێزگەکان.. هتد.

4- ناوی جێگای هەندێکی وەکو زاراوە بەکاردەهێنرێت، وەکو ڕوانگە، سازگە، خولگە، زانستگا.

نەخوێندەواری نەمابێ لەناو دانیشتووان
دەیا زانستگا دروستکرابێ لە کوردستان
(م. م. ك، ڕۆژی نوێ ژ (2)، ل17)

## «بابەتی پێنجەم»

## ناوی ئامێر: «اسم الآلە- Instrument»

ئەو ناوانەن کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن وەکو ئامێرێك بۆ جێبەجێ کردنی ئیش و کار بەکاردەهێنرێن لەلایەن مرۆڤەوە.

ناوی ئامێر یەکێکە لەو ناوانەی چ بەگشتی و چ بەتایبەتی لە چاوگەوە بەدەگمەن نەبێت – ناوی جێگاش هەر بەو شێوەیەیە- لێکۆڵینەوەی لەسەر نەکراوە و باسی تایبەتی لە بارەوە نەنووسراوە و هەر لەژێر بابەتی ناوی ئاساییدا لێوەی کۆڵراوەتەوە. لە کاتێکدا پێویستی بە لێدوانێکی سەربەخۆ هەیە لەژێر باسی ((ناوی ئامێر))دا تا بتوانرێ لە رێگای پێکهاتن و دروستبوونیانەوە بەرچاو بخرێت و یەکەیەکەی رێژەکانی بدۆزرێتەوە.

بەڵام بایەخ نەدان و کەم لێکۆڵینەوە دەربارەی ناوی ئامێر و نەبوونی وشە و زاراوە بۆ ئامێری داهێنراوی تازە هۆی دواکەوتوویی پیشەسازییە لەلای کورد لە چاو میللەتە پێشکەوتووەکانی جیهان کە لە بواری جۆربەجۆری پیشەسازیدا سەرکەوتوون، دەنا هیچ زمانێکی جیهان نرخی لە زمانی میللەتێکی تر زیاتر نییە و هەموو زمانێك ڕادەی بارودۆخی میللەت و وڵاتەکەی وای کردووە لە چ جۆرە وشەیەکدا دەوڵەمەند بێت ((ئەگەر هاتبایە لکە بێ ئەژمارەکانی زانست و پیشەسازی و تەکنیك کە سەرچاوەی داهێنانی جۆرەها دروستکراوی سەر سوورڕێنی وەکو فڕۆکە و کۆمپیوتەر و کەشتی ئاسمانین بە زمانی کوردی و لە مێشکی کورد و بۆ ساختمانی کورد رسکابان ئەوسا زانای کوردیش بە ئاسانی زاراوەی (ناوی ئامێر) لەبارەی بۆ هەزاران هەزار ئامێری ورد و درشتی ئەو دروستکراوانە دادەنا، هەروەك لەخۆوە فەلاحی کورد زاراوەی بۆ وردە ئامرازی کاروباری جووت دانا، هەروەهاش خەڕەك رێس و وەستای ئاش))[74].

---

(74) مەسعوود محەمەد، زاراوە سازیی پێوانە، سەرچاوەی پێشوو، ل 221.

لە خوارەوە شێوەی پێکهاتنی (ناوی ئامێر) و ڕیژەکانی دەخەینەڕوو، بەپێی بوونی ئەو ڕێژانەی کە هەن و یا دەشێن ببنە ناوی ئامێر لە زمانی کوردیدا:

## 1- ناوی ئامێری داڕێژراو:

بنەواشەی یەکەم: لە ڕەگی تێپەڕ و (بەدەگمەن تێنەپەڕ) و پاشگرەوە دروستدەکرێن، وەك: پاشگری ((ەك، نگ (ینگ، ە، گی)). پاشگری ((ەك)) پاشگرێکی بەکارە ((لە وشەسازیی کوردیدا دەورێکی گەورە دەبینێت چ بە تەنها بێتە ناو تەکوینی وشەوە چ لەگەڵ دەنگی تردا. تۆژینەوەی سەر لە باسی دەوری (ك) لە وشەسازی کوردی زۆری بە بەرەوەیە ـــ دیارە هەمان قابلیەتی زێدە بەرچاوی دەنگی (ك) لە پێکهێنانی وشەی (ناو، ئاوەڵناو، ناوی ئالەت...))[75] هەیە. ((ەك)) بەواتای ((پێوەلکان و پێوەنووسان)) دێت.

چاوگ: ڕەگ + ەك ـــــــــ ڕەگەك ناوی ئامێر

کوتان: کوت + ەك ـــــــــ کوتەك

بەم پێیە ئەم پاشگرە و پاشگرەکانی تەکی ئەم ناوی ئامێرانە دروستدەکەن: پەستەك، هێڵەك، کوتەك، بڕەك، بێژنگ، بڕینگ[76] (یا ((چێرگ)) بۆ بڕینەوەی مەڕو بزن)، گیرە، ماڵە ((لە (ماڵین)ەوە پارچە ئاسنێکی درێژە نزیکەی دوو مەترە لەدوای خرماشەی تراکتۆرەوە بۆ تەخت کردنی هێڵی جووتەکە))، بادە لە (بادان)ەوە، رایەخ لە (رایەخستن)ەوە. تەقیلە لە (تەقین)ەوە: تەقی + لە ـــــــــ تەقیلە واتە جام یا تاسی ئاو خواردنەوە. چەند نموونەیەك:

هەندێك ناوی ئامێر هەن لە ڕواڵەتدا لە ناوی ئامێری سەربەخۆ دەچن، بەلاَم لە ڕەگی چاوگی تێپەڕ و تێنەپەڕەوە بەلادانی نیشانەی چاوگ وەردەگیرێن، وەك: ساز، پاچ، بلوێر، گەز، گاز، بلوور.

---

(75) مەسعوود محەممەد، چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی، ل 26.

(76) بڕوانە: عبدالرحمن امین زەبیحی، قامووسی زمانی کوردی (ب)، ل 76-77.

دەستم لە بادە هەڵگرت و سازو نەیم فڕیدا
ترسی قیامەتم بوو ڕوو ڕەش نەبم لەوێدا
(بێکەس، ل 126)

بنەواشەی دووەم: لەسەر پێوانە و ڕێژەی (فڕۆکە) دەشێ و دەتوانرێ لە ڕەگی چاوگی تێپەڕ و تێنەپەڕ و پاشگری (ۆك) هەندێك ناوی ئامێر لە ڕووی دەستوورەوە پێکبهێنرێت وەك:

پەستان: پەست + ۆك ———— پەستۆك

هەروەها: ڕژۆك، بڕۆك، پەستۆك، سڕۆك.

ئەم ڕێژەیەی ناوی ئامێر لە چاوگەوە وەرگیراوە بەکارهێنانی کەمە، بەڵام بۆ ناوی ئامێر لە بارە.

بنەواشەی سێیەم: لە پێشگر و ڕەگی چاوگی تێنەپەڕ و تێپەڕەوە ئەم ناوە ئامێرانە بەکاردێن، وەك:

(پێنووس) لە چاوگی (نووسین)ەوە، پێخۆر لە (خواردن)ەوە، پێشۆر، پێپۆش، پێماڵ، پێبەست، پێگیر، پێبڕ، پێسووت.

ئەم ڕێژەیە ((کە))ش وەکو پاشگر وەردەگرێ و شیاوی بەکارهێنانیشە لەسەر پێوانەی ((ئاو ماڵکە)) وەکو: پێ شۆرکە، پێ پۆشکە، پێماڵکە، پێ بڕکە.

((پێ)) لەڕووی واتاوە ((هۆ)) دەردەخات.

چ هی پێنووس، چ دەمیمان
بە تاقە یەك زاری شیرین
(دیوانی، گۆران، ل 312)

ناوی ئامێری دارڕژاو هەیە لە ڕەگی چاوگی بەتێپەڕکراو بەهۆی ((اندن))ەوە بەهۆی پاشگری ((ە))ەوە بۆ ئامێری تازە بەکارهێنراو بەکاربهێنرێت(77) وەکو: ڕژاندن: ڕژێن + ە ـــــ ڕژینە، ڕشێنە، جۆلانە..

ئارامگای شۆخی دیدە مەستانە

ڕشینەی ڕوخسار حەسرەت کێشانە

(پیرەمێرد، ل 48)

## 2- ناوی ئامێری لێکدراو:

ڕێژەیەك هەیە کە سەربەخۆ کوردەواری بۆ ئامێری پێویستی ئیش و کاری ڕۆژانەی بەکاری هێناوە. ئەم ڕێژەیە لە (ناوی بکەر) زۆر نزیکدەبێتەوە، بەوەی کە ئیش و کار جێبەجێ دەکات.

ا- ئەم ڕێژەیە لە وشەیەکی واتادار (بەزۆری ناو) لەگەڵ ڕەگی تێپەڕو تێنەپەڕدا بەلادانی نیشانەی چاوگەکەیان وەردەگیرێ، وەك:

باوەشاندن: باوەشێن

شەکرشکاندن: شەکر شکێن

هەروەها: قەڵەمتاش، خاکەناس لە (خاك ئەنداز)ەوە هاتووە دەسشۆر، چاپاڵێو، پەڵاوپاڵێو، دەسماڵ، بەفرماڵ، مێکوت، سەرپۆش، دەستاڕ (لە دەستهاڕین)ەوە، دەسرازە ((لە (دەس ڕاژەندن)ەوە بۆتە دەس ڕاژە ـــــ دەسراژە)، کەوگیر، دەستەسڕ، ڕۆتکەن (ڕۆنتکەن).

ب- ناوی ئامێر هەیە لە ئاوەڵفرمان و ڕەگی چاوگ پێکدەهێنرێت. جاری واش هەیە ئامرازی لێکدەر دەچێتە نێوانیانەوە، وەك:

بەرماڵێن: بەرماڵ، پێشتەماڵ، بەرکۆش (بەرکۆشە)، لاگیرە، باگردێن.

---

(77) بڕوانە: مەسعوود محەممەد، زاراوە سازیی پێوانە، ل 171.

تێبینییەك پێویستە دەسنیشان بكرێت، ئەویش ئەوەیە لە بەشی لێكدراوی ئەم ناوانە، چاوگ دەورێكی چالاك و گرنگتر دەبینێت و وشەكەی پێش ڕەگی چاوگەكە دەچێتە ژێر دەسەڵات و هێزی چاوگەكانیانەوە، لەڕووی واتای پێشوویانەوە بێهێز بوونە، بۆیە لەم پێكهاتنەدا چاوگ دەورێكی سەرەكی دەبینێت، نەك وشەكەی پێشیانەوە. بۆ نموونە:

شێر و قەڵەم شەریكن، لەم عەسرەدا دریغا
شێرم قەڵەمتراشە و كالانییە قەڵەمدان
(حاجی قادر، ل 87)

جـ- ڕێژەیەكی تری (ناوی ئامێری لێكدراو) هەیە لە ئاوەڵناو و ڕەگی چاوگ پێكدێت، وەكو: ڕەشماڵ، بڵندگۆ (بڵێندگۆ)

چاپخانە و بڵێندگۆمان
بوونە بەردی بن گۆمان
(تاریك و ڕوون، ل97)

تایبەتییەكانی ناوی ئامێر:

ناوی ئامێر ئەم تایبەتییانە دەگرێتە خۆی:

1- هەندێك ناوی ئامێر هەن دەشێن ببنە زاراوە، وەك: ڕۆتكەن (ڕۆنتكەن)

بۆ شاستانەی وەرە ئەی تیرە دڵ نەخۆش
هەر حوجرەیەكی (ڕۆتكەن)ی صەد كارەبایە غەوث
(بێخود، ل 20)

2- ناوی ئامێر وەكو ناوێكی ئاسایی كۆدەكرێتەوە نیشانەی (ان)ی كۆ وەردەگرێت، وەكو: ڕەشماڵان، بڵێند گۆیان، پەستەكان، ڕشێنان، پێ پۆشان.

3- نیشانەی ناسراوی و نەناسراوی وەردەگرێت کە تایبەتێتی ناوە، وەك: بڵیند گۆکە، سەرپۆشەکە، پەستەکەکە، ڕشێنەکە، بڵیند گۆیەك، سەرپۆشێك، دەسڕەکە.

دەسڕەکەی دەستت چیتی گوڵ شینە
بۆ ئارەق سڕین شەڕ فەلەستینە
(فۆلکلۆری دەسنووس)

من باوەشینەکە لەسەر دەسکەکەی قیت دائەنیم.
(ڕشتەی مرواری، ل 134)

4- شێوەی ئیدیەم ناگرێتە خۆی، چونکە شێوە لێکدراوێکەی لە واتاکەی خۆی دوور ناکەوێتەوە، کە دەبێتە لێکدراو.

5- وەکو ناوی ئاسایی لە ئاخاوتن و نووسیندا بەکاردەهێنرێت، بەڵام لەڕاستیدا وەکو ناوی ئاسایی نییە چونکە ناوی ئامێر کارێکی پێدەکرێت یا هۆیەکە بۆ کار جێبەجێ کردن لە شێوەی ناوی بکەردا.

6- ڕێژە لێکدراوێکەی ناوی ئامێر وەکو (ناوی بکەر) وایە، وەك: سەرپۆش، شەکرشکێن، ڕۆتکەن (ڕۆنتکەن)، بڵیندگۆ، دەستەسڕ، باوەشێن، بڕبەن.

خاقانە گەسك لێدەر، بۆ خادیمی بەرقاپیت
خوددامە بەڕوح قەیصەر، بۆ بان گوشی سەربانت
(بێخود، ل 16)

ئەژدە هاك کون بڕە، سەختە زیندانت
نارۆشێ بە بڕبەن بەندی گرانت
(دیوانی گۆران، ل 268)

لەم بەشەی نامەکەدا کە بریتییە لە دیاریکردنی ئـەو ئەنجامانـەی کـە لـە ئـەنجامی لێکۆڵینەوەکانی بەشی یەکەم و دووەمی ئـەم نامەیـەدا پێـی گەیـشتووین، کـە ئـەویش پیشاندانی لایەنە جۆربەجۆرەکانی بابەتەکانی ئەم باسەیە لە یاسا و دەستووری دارِشـتن و پێکهاتنیان و لایەنی بەکارهێنان و تایبەتێتییان.

دوای هەڵسەنگاندن و نرخاندن و بەراوردکردنی ئەوەی هەر لە زووەوە تاکو ئـەمڕۆ لـە بارەی ئەو کێشەیەوە نووسراوە و چوونە ناو زمانەکە و لێکدانەوە و شوێن کەوتن و... ئەو ڕێگەیان بۆم خۆشکرد بگەمە هەندێ ئەنجامی راست و بەکەڵك:

ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن وەك (ناوی بکەر، نـاوی بـەرکار، نـاوی چـاوگ، ناوی جێگا، ناوی ئامێر) واتای ڕوودانی چاوگەکانیان (فرمانـەکانیان) هەڵـدەگرن، بـەڵام کەس و کاتیان تێدا بەدی ناکرێت و بەگشتی بەهۆی پێشگر و پاشگرەوە بە ڕێگای دارِشتن و لێکدانەوە وەردەگیرێن.

لەڕووی دارِشتن و پێکهاتنەوە ڕێژەیەکی ناوی بکەر و ناوی چاوگ کە لە قەدی تێنەپەڕ و پاشگری (و، وو) و لە قەدی تێنەپەڕ و تێپەڕ و پاشگری (ار)، وەکو: کەوتوو، نوسـتوو، کوشتار، بڕیار و تێکڕای ڕێژە دارِێژراوەکانی (ناوی بەرکار)یشی.

لێ دەرچێت، کە لە قەدی چاوگ و پاشگرەوە دروستدەکرێت. هەموو بابەتەکانی تـری (ناوی بکەر، ناوی چاوگ، ناوی جێگا، ناوی ئامێر) لە ڕەگی چاوگ و پێشگر و پاشگرەوە یا تەنها لە ڕەگی چاوگەکەوە پێکدەهێنرێن. وەکو (بکێش، نووسەر، پرسە، پرس، جمگە، هەڵدێر، بەستەك، گاز...). هەموو ئەو بابەتانەی سەرەوە لـەڕووی پێکهاتنـەوە دارِژاو و لێکدراون، تەنها ڕێژەیەکی (ناوی چاوگ) و یەك دوو نموونەی (ناوی ئامێر) نەبێت سادەن، وەك (پرس، دز، خەو، گاز، گەز). بابەتەکانی سەرەوە هەموویان لە ئاخاوتن و نووسـیندا وەکو ناو بەکار دەهێنرێن، بەڵام ناوی بکەر و ناوی بەرکار بەپێی بەکارهێنان وەکو ناویش و ئاوەڵناویش بەکار دەهێنرێن. کەچی ناوی ئاسایی ئەم شێوە بەکارهێنانەی وەکو ئاوەڵناو نییە. هەروەها دەشێن ببنە زاراوە و ئیدیەم و وەکـو نـاوی ئاسـایی تێکرایـان نیـشانەی ناسراوی و نەناسراوی وەربگرن، چونکە وەکو ناوی گشتی وان و هەر لەبەر ئەمەشە زۆریان

نیشانەی (کۆ) وەرناگرن. ئەمە بەگشتی لە بارەی هەموو بابەتەکانەوە بوو، بەڵام لە خوارەوە لە یەکەیەکەیان دەدوێین:

ناوی بکەر بریتییە لەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن و توانایەکی تایبەتی و سیفەتێکی هەمیشەییان هەیە و کار و کردەوەیەك جێبەجێ دەکەن. ناوی بکەر وەکو لەسەرەوە خستمانەڕوو ڕێژەیەکی نەبێت لە قەدی تێنەپەڕەوەیە، دەنا هەموو بە دارِژاو و لێکدراوەوە لە ڕەگی چاوگەوە وەردەگیرێن. ئەو ڕێژەیەی کە لە قەدی تێنەپەڕەوەیە ئەگەر چاوگەکەی دارِژاو یان لێکدراو بێت بەزۆری ناوە بکەرێکان شێوەی (ئاوەڵناوی بکەر) دەگرنە خۆیان- واتە لەڕووی واتاوە ئاوەڵناون، ئەگەرچی بەهۆی نیشانەی ناسراوی و نەناسراوییەوە، وەکو ناو بەکار دەهێنرێن. وەکو: پەك کەوتوو[1]، داهاتوو، پێ گەیشتوو، زگ سووتاو، دڵ مردوو.

ڕێگای پێکهاتن و وەرگرتنی ناوی بکەر لە چاوگەوە لە هەموو بابەتەکانی دی وەك (ناوی بەرکار، ناوی چاوگ، ناوی جێگا، ناوی ئامێر) زیاتر بڵاوە. ناوی بکەر ئەگەر چاوگەکەی ئاوەڵفرمانی (نە) و پێشگری دارێژی (هەڵ، دا، ڕا) بچێتە پێش و ببێتە دارێژراو ئەوە پێویستی بە پاشگر و پێشگری تایبەت بە ناوی بکەر نابێ و لە هەمان کاتدا بەلابردنی نیشانەی چاوگەکانیان (ناوی بکەر) پێکدێن، وەك: زانین، زانا ـــ نەزان، هەڵگرتن ـــ هەڵگر، ڕاکێشان ـــ ڕاکێش، ڕاگرتن ـــ ڕاگر. بگر ـــ داگر. کەواتە (نە)ی نەرێ و پێشگری (هەڵ، دا، ڕا) شوێنی پاشگر و پێشگرە بکەرێکان دەگرنەوە.

دوای لێکۆڵینەوە و پشکنینێکی زۆر دەرکەوت کە نیشانەی (ەر)ی ناوی بکەر لە زمانی کوردیدا هەیە و زۆر کۆنە و چۆتە سەر ناویش، وەك لە وشەی (کۆچەر، چەپەر، سەنگەر)[2] کە لە وشەی (کۆچ، چەپ، سەنگ) و نیشانەی (ەر) پێکهاتوون و (کۆچەر)یش ناوی بکەرە، ئەگەرچی لە ناوەوەش پێکهاتووە، بەڵام بکەرێتی (فاعیلیەت)ی تێدایە و لە چاوگیشەوە وەکو لە (نانکەر، پەیامبەر) دا هەیە، بەڵام لە سەرەتای

---

(1) پەك: وەکو پێشگر بە واتای (هێز و توانا)، دێت.

(2) چەپەر: بە واتای دەرگای تەیمان (پەرژین) و پارێزەری باخچە دێت.

پەنجاکانەوە لە وشەسازکردندا بەکارهێنانی فراوان و بەربڵاوبووە و لە هەموو چاوگێکی تێپەڕەوە چ سەربەخۆو چ لە چاوگە ناوێزەکانەوە بە یاریدەی پێشگری (ب)ی ناوی بکەرێوە ناوی بکەر دروستدەکات، وەك: (نووسەر، بکەر بینەر، بخەر...) و بەهەمان شێوە پێشگری (ب)ی ناوی بکەری کۆنە و لە فۆلکلۆردا هەیە وەك: (ببڕ و بکوژ هەر خۆیەتی)، لە ڕەگی هەموو چاوگێکی تێپەڕەوە چ سەربەخۆو چ بە یاریدەی (ەر)ەوە ناوی بکەر پێکدەهێنێت، وەك نموونەکانی سەرەوە.

ناوی بکەر لەڕووی بەکارهێنانی جۆربەجۆری وەك (ناو، ئاوەڵناو، کاروپیشە و زاراوە و ئیدیەم لە هەموو بابەتەکانی تر چالاکتر و بەکارهێنانی زیاترە و لەڕووی توخمیشەوە ناوە بکە رێکانی پیشەوکار بۆ نێرو مێ و دوولایەن دابەش دەبن. هەروەها ناوی بکەری لێکدراو ئەوانەی لە ئاوەڵناو و ئەندامانی لەشی مرۆڤ (گوێی، سەر)ی لێ دەرچێت لە ڕەگی چاوگەوە پێکدێن (ئاوەڵناوی بکەری لێکدراو) پێکدێنن و وەکو ئاوەڵناون. ناوی بەرکاریش لە چاوگەوە وەردەگیرێن و سیفەتێکی کاتییان هەیە و کەسوکاتیان تێدا بەدی ناکرێت و واتای ڕوودانی چاوگ و فرمانەکانیان تێدایە و کردەوەیەکیان بەسەردا هاتووە. لەڕووی پێکهاتنەوە وەکو دەستوور زۆربەی شێوەکانی لە قەدی چاوگەوە بەزۆری لە تێپەڕەوە وەردەگیرێت و لە ئاخاوتن و نووسیندا وەکو ناویش و ئاوەڵناویش بەکاردەهێنرێت و ئەرك و تایبەتێتی ناوی ئاسایی وەردەگرێت و لەبەرئەوەی لە چاوگەوە دروستبووە و وەکو ئاوەڵناویش بەکاردەهێنرێت لە ناو و ئاوەڵناوی ئاسایی جیا دەکرێتەوە. بەشێوەی ناوی بکەر زاراوەی لێ وەردەگیرێت و لە ڕێژە لێکداروەکانیشی تێدا هەن ببنە ئیدیەم.

ناوی بەرکار ڕێژەیەکی هەیە لە قەدی چاوگی تێنەپەڕی ڕوودان و پاشگری (و) و ئەو ڕێژەیەی کە لە قەدی چاوگی تێنەپەڕی گوێزانەوە و پاشگری (و)ەوە ناوی بکەر پێکدەهێنێت، لەلایەن زمانەوانانەوە هەردووکیان تێکەڵکردووە و بە ناوی بکەر یا بە ناوی بەرکار زانیوە، هەمان ڕێژەشیان لە تێپەڕەوە تێکەڵ بەو ڕێژەیە کردووە، کە ڕاستێکەی ناوی بەرکارە وەك: خواردوو، کردوو، کێڵاو، هێناو. ڕێژەیەکی تری ناوی بەرکار هەیە کە لە ناوێك و قەدی چاوگ و پاشگری (و) پێکدێت لەگەڵ ناوی بکەردا بەهۆی ناوەکەی تەکیەوە لە یەکتر جیا دەکرێنەوە. ئەگەر ناوەکە لە دەوری بکەردا بێت،

ڕیژە لێکدراوەکە دەبێتە (ناوی بەرکار) وەك: با بردوو... بەڵام ئەگەر ناوەکەی دەوری بەرکاری هەبێت، ئەوا دەبێتە (ناوی بکەر)، وەك: بەش خواردوو، زگ سووتاو... ناوی چاوگ ئەو ناوانەن لە چاوگەوە وەردەگیرێن و کەسوکاتیان تێدانییە، بەڵام واتای ڕوودانی چاوگەکەیان دەگەیەنن و سەربەخۆ نین و لەشتی تردا هەن.

هەروەکو لەپێشەوە وتمان ڕیژەیەکی نەبێت لە قەدی چاوگەوە وەردەگیرێت، ئەگینا هەموو ڕیژەکانی تری لە ڕەگی چاوگی تێنەپەڕ و تێپەڕەوە پێکدەهێنرێن وەك: کوشتار، دز، پرس، پرسە، کۆکە، خۆراك، پۆشاك... ناوی چاوگیش بە شێوەی بابەتەکانی تر نیشانەی ناسراوی و نەناسراوی وەردەگرێت، بەڵام لەبەرئەوەی وەکو ناوێکی گشتی وایە و چەمکی گشتی هەیە و نیشانەی (ان)ی کۆ وەرناگرێ و هەندێکیان دەبنە زاراوەش.

وەرگیرانی ناوی جێگا لە چاوگەوە لە وشەسازی کوردیدا زۆر بەدەگمەن لێی کۆڵراوەتەوە. بەپێی پێوان وەکو دەستوور و گونجان لە ڕەگی چاوگی تێپەڕ و تێنەپەڕی گوێزانەوەوە بە یارمەتی پاشگری (گە، ەن)ەوە وەردەگیرێن و شوێنی دیاریکراو و تایبەتی دەبەخشن، وەکو: جمگە، پرسگە، فرۆشگە، وێستگە، ڕیژەن، سووتەن... سەربەخۆش لە ڕەگی چاوگەوە ساز دەدرێن، وەك: (هەڵدێر، بنکە، کەند ...) کە لە چاوگی (هەڵدێران، بنکردن، کەندن...)ەوە هاتوون.

ناوی ئامێر ئەو ناوانەن لە چاوگەوە بەرێگای دارشتن یا سەربەخۆ لە چاوگەوە وەرگیراون بۆ جێبەجێ کردن و ڕاپەڕاندنی کار بەهۆیانەوە. ئەم ناوانە بە چەند شێوەیەك لە ڕەگی چاوگی تێنەپەڕ و تێپەڕەوە بەهۆی پێشگر و پاشگر یا وشەیەکی واتادار بەشێوەی دارژاو و لێکدراو بەدەگمەنیش سادە پێکدەهێنرێن. وەك: کوتەك، ڕشێنە، پەستۆك، پێماڵ، دەستەسڕ، نینۆك بڕ، گەز، گاز...

ناوی ئامێر، ڕیژە لێکدراوەکەی بەشێوەی ناوی بکەر لە جێبەجێ کردنی کاردا بەشداری دەکات، وەك: قەڵەمبڕ، شەکر شکێن... ناوی ئامێر تێیدا هەیە وەکو زاراوەش لە ئاخاوتن و نووسیندا بەکار دەهێنرێن وەك: بڵێند گو، ڕوانگە، ڕۆتکەن... ئەم جۆرە ناوە وەکو دەستوور بەرێگای پێوانەوە دەلوێت بۆ ئامێری تازە داهێنراو و داهاتوو لە چاوگەوە بە یارمەتی پێشگر و پاشگرەوە ژمارەیەکی زۆر پێکبهێنرێن، وەك: ڕژۆك، پەستۆك، پێپۆش، پێماڵ، پێپەست..

## سەرچاوەی نموونەکان


1- (بێخود)

دیوانی بێخود، کۆکردنەوە و ڕێکخستن و لەسەر نووسینی محەممەدی مەلا کەریم، چاپخانەی سلمان الاعظمي، بەغدا، 1970.

2- (بێکەس)

دیوانی بێکەس، محەممەدی مەلا کەریم ڕێکی خستووە و سەرەتای بۆ نووسیوە و سەرپەرشتی لە چاپدانی کردووە، چاپخانەی (الادیب)، بەغدا، 1980.

3- پەندی پێشینان، کۆکردنەوەی شێخ محەممەدی خاڵ، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، 1957.

4- (پیرەمێرد)

دیوانی پیرەمێرد، محەممەد ڕەسول هاوار، بەغدا، 1970.

5- (تحفهء مظفرية، ب2)

ئۆسکارمان، تحفهء مظفریه، بەرلین، 1905، پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانە سەر ڕێنووسی کوردی هێمن موکریانی، بەشی دووەم، بەغدا، 1975.

6- جەمال شارباژێری، فرمێسکی نهێنی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، 1968.

7- (حاجی قادر)

دیوانی حاجی قادری کۆیی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی سەردار حەمید میران، کەریم مستەفا شارەزا، لە چاپکراوەکانی ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان ناوچەی کوردستان، هەولێر، 1986.

8- ڕۆژی نوێ، ژمارە 7، ساڵی یەکەم، سلێمانی، 1960.

9- (شێخ رەزا)

دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، 1957.

10- عەلائەدین سەجادی، ڕشتەی مرواری، بەرگی هەشتەم، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، 1983.

11- عەلائەدین سەجادی، کوردەواری، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، 1974.
12- فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری، کۆکردنەوەی محەممەد کەریم شریف، چاپخانەی الشمال کەرکوك، 1974.
13- گۆران، بەهەشت و یادگار و فرمێسك و هونەر لەگەڵ دوو هاوینە گەشت چاپخانەی کامەران، سلێمانی، 1971.
14- گۆران، سروشت و دەروون لەگەڵ ئۆپەرێتی ئەنجامی یاران، چاپخانەی کامەران، 1968، سلێمانی.
15- (گۆران) سەرجەمی دیوانی گۆران، بەرگی یەکەم، محەممەدی مەلا کەریم کۆی کردۆتەوە و ئامادەی کردووە و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، 1980.
16- محەممەد صالح دیلان، دیوانی شیعر، ئامادەکردن و لێکۆڵینەوە و پێشەکی و پەراوێز نووسینی، عەبدوڵڵا عەزیز خالد چاپخانەی سۆمەر، بەغدا، 1987.
17- (نالی)
دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عبدالکریم مدرس و فاتح عبدالکریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1976.
18- هێمن، تاریك و روون، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی پێشەوا، 1974.
19- هێمن، ناڵەی جودایی ((شیعر))، چاپخانەی عەلا، بەغدا، 1979.
20- هۆنراوەی گۆرانی فۆلکلۆری کوردی، دەسنووس، کۆکردنەوەی رەفیق محەممەد محێدین شوانی، ناوچەی شوان، هاوینی 1976.

## سەرچاوەکان

**بە زمانی کوردی:**

1- ئیبراهیم ئەمین باڵدار، زاراوە و زمان لە کاروانی زانیاری ئەمڕۆدا، گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ))، ژ 112، بەغدا، 1986، ل 212-232.

2- ئەحمەد حەسەن ئەحمەد، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی (دار الجاحظ)، بەغدا، 1976.

3- د. ئەورڕەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1975.

4- د. ئەورڕەحمانی حاجی مارف، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کوردی، بەغدا، 1976.

5- د. ئەورڕەحمانی حاجی مارف، وشە ڕۆنان لە زمانی کوردیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کوردی، بەغدا، 1977.

6- د. ئەورڕەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کوردی، بەغدا، 1979.

7- د. ئەورڕەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، 1987.

8- بەهزاد، چاوگی کوێرەوە بوو لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری ((بەیان))، ژ 2، بەغدا، 1972، ل 23-25.

9- تۆفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، جزمی یەکەم، چاپخانەی دار الطباعة الحديثة، بەغدا، 1929.

10- جگەر خوێن، ئاوا ئو دەستوورا زمانی کوردی، چاپخانەی صلاح الدين، بەغدا، 1961.

11- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لێژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1976.

12- سەعید صدقی، مختصر صرف ونحوی کوردی، چاپخانەی نجاح، بەغدا، 1928.

13- صالح حوسێن حەسەن پشدەری، کورتەیەك لە ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی بەغدا، 1985.

14- عەبدوڵڵا شالی، د. عیزەدین مستەفا ڕەسوول، د. ئەمین عەلی، نووری عەلی ئەمین، فەرەیدوون عەلی ئەمین، عەلائەددین سەجادی، کەمال مەحموود فەرەج، ئەبو زەید مستەفا سندی، زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی، هەولێر، 1982، بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەی،

هەولێر، 1982، بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەی، چاپخانەی ژمارە (2) وەزارەتی پەروەردە، هـەولێر، 1982.

15- عەبدولڕەزاق بیمار، زاراوەکانی ناو کتێبانی قوتابخانــە، گۆڤـاری ((رۆشــنبیری نــوێ))، ژ 111، بەغدا، 1986، ل 286-302.

16- عەبدولڕەحمان محەممەد ئەمین زەبیحی، قامووسی زمانی کـوردی، بـەرگی دووەم، ((ب))، بەغــدا، 1979.

17- عەبدوڵڵا شاڵی، (سەر) و (چاو) و (دەست) لە وشەسازی زمانی کوردیدا، گۆڤـاری ((پــەروەردە و زانست))، ژ 17، بەغدا، 1980، ل3-13.

18- عەبدوڵڵا شاڵی، ناوی بکەر لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری ((پــەروەردە و زانــست)) ژ 15، بەغــدا، 1979، ل 5-7.

19- عەبدولموحسین بەنی وەیس عەلی، چەند زاراوەییێکی رەسەن، گۆڤاری ((رۆشنبیری نوێ))، ژ 114، بەغدا، 1987، ل 154-161.

20- غازی فاتح وەیس، جیاوازی نێوان فۆنیم و مۆرفیم، گۆڤاری ((رۆشنبیری نوێ))، ژ 107، بەغدا، 1985، ل 190-195.

21- فاچل عومەر، نێڤگر د زمانی کوردیدا، گۆڤاری ((رۆشنبیری نوێ))، ژ 109، بەغدا، 1986، ل 265-276.

22- فارووق عومەر صدیق، وشەسازی لە زمانی کوردیدا، لە بەشی دووەمی بەرگی سێیەمی گۆڤـاری ((کۆڕی زانیاری کورد)) دەرهێنراوە، بەغدا، 1975.

23- د. کامیل حەســەن بەسـیر، پێناســینی زاراوە، گۆڤـاری ((رۆشــنبیری نــوێ))، ژ 111، بەغــدا، 1986، ل 213-218.

24- د. کامیل حەســەن بەسـیر، زاراوەی کــوردی لێکۆڵینــەوە و هەڵــسەنگاندن، چـاپخانەی زانکـۆی سلێمانی، 1979.

25- د. کامیل حەسەن بەسیر، زانستی ئاوەڵناو، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، 1981.

26- ك. ك. کوردۆییێف، رێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمــانجی و ســۆرانی، د.کوردســتان موکریانی لە زمانی روسییەوە وەری گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، لە بڵاوکراوەکــانی ئەمینــداریێتی گشتی رۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان، هەولێر، 1984.

27- د. کەمال فوئاد، موحازەرەکانی ڕێزمانی کوردی بۆ پۆلی دووەمی بەشی کوردی کۆلێجی ئاداب، زانکۆی سلێمانی، ساڵی خوێندنی 1973/1972، بەناوی ((وەرگێراوەکانی فرمان- مشتقات الافعال)). لە ڕۆژی 5/7، 1973/5/16.
28- گیوی موکریانی، ئەلف و بێی کوردی وێنەدار بەتیپی لاتینی، بە زاراوەکانی سۆرانی، بادینی، فەیلی، هەورامی، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، 1972.
29- محەممەد ئەمین هەورامانی، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی، بەغدا، 1973.
30- محەممەد ئەمین هەورامانی، زاری زمانی کوردی لە تەرازووی بەراورددا، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، 1981.
31- محەممەد ئەمین هەورامانی، زمانەکەمان لە کوێوە هاتووە؟ گۆڤاری بەیان، ژ 13، بەغدا، 1974.
32- مەسعوود محەممەد، چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1976.
33- مەسعوود محەممەد، خۆدیتنەوە لەدوو ڕەخنەی دۆستاندا، گۆڤاری ((کاروان))، ژ 7، هەولێر، 1983، ل 41-46.
34- مەسعوود محەممەد، زاراوە سازیی پێوانە، گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ))، ژ 111، بەغدا، 1986، ل220-272.
35- مەسعوود محەممەد، زاراوەی پێوانە، بەشی دووەم، ناوی داڕێژراو، گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ))، ژ12، بەغدا، 1986، ل 162-210.
36- مەسعوود محەممەد، (کۆڕی زانیاری کورد) چۆن ئەم ناوەی وەرگرت؟ گۆڤاری ((زانیاری))، ژ 4، بەغدا، 1971، ل 57-71.
37- محەممەد ئەحمەد سەعید، چەند سەرنجێکی زمانەوانی دەربارەی کتێبی ڕێزمانی کوردی د. ئەوڕەحمان، گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ))، ژ 93، بەغدا، 1982، ل 40-44.
38- محەممەد مستەفا کوردی، مستەفا صالح کەریم، ئەبوبەکر جەلال، عەبدوڵڵا میدیا، زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی، چاپی دووەم، بەغدا، 1972.
39- محەممەد مەعروف فەتاح، دیسان ئیدیەم پێداچوونەوەیەك لەبەر ڕۆشنایی زمانەوانیدا، لە ب 11ی ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق- دەستەی کورد)) دەرهێنراوە، بەغدا، 1986.
40- د. نەسرین فەخری و د. کوردستان موکریانی، ڕێزمانی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی بەشی زمانی کوردی زانکۆی سەلاحەددین، 1982.

41- د. نەسرین فەخری، ڕێبازی بە کوردی کردنی زاراوە، گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ))، ژ 114، بەغدا، ل 123-136.
42- د. نەسرین فەخری، فەرهەنگی ناوی دەنگ لە زمانی کوردیدا، ((گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات))، ژ 18، 1974، ل95-117.
43- د. نەسرین فەخری، لیکسیکۆلۆگیا، پەرەسەندنی مێژوویی واتای وشە و دەوری لە دەوڵەمەندکردنی زماندا، گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ))، ژ 107، 1985، ل180-189.
44- د. نەسرین فەخری، لیکسیکۆلۆگیا، گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ))، ژ 111، بەغدا، 1986، ل 140 -146.
45- نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، 1960.
46- نووری عەلی ئەمین، دەوری پیتە بزوێنی (ە) لە زمانی کوردیدا گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژ 111، بەغدا، 1986، ل 169-181.
47- نووری عەلی ئەمین، قەواعیدی زمانی کوردی لە (صرف و نحو)دا بەرگی یەکەم، بەغدا، 1956، بەرگی دووەم، بەغدا، 1958.
48- د. وریا عومەر ئەمین، تێنەپەڕ فرمانێکی بکەر نادیارە، گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ))، ژ 107، بەغدا، 1985، ل195-200.
49- د. وریا عومەر ئەمین، مردنی وشە، گۆڤاری (کاروان)، ژ 45، هەولێر، 1986، ل8-14.

**بە زمانی عەرەبی:**

50- الاستاذ الشيخ احمد الحلاوي، شذا العرف في فن الصرف، مطبعة دار الكتب المصرية، 1927.
51- الدكتور عبده الراجحي، التطبيق الصرفي، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت، 1979.
52- محمد التقي الحسيني الجلالي، نزهة الطرف في علم الصرف، مطبعة دار النعمان – النجف، 1977.

**بە زمانی ئینگلیزی:**

53- D. N. Mackenzie, Kurdish Dialect Studies, London, 1961.
54- Ernest N. Mccarus, A Kurdish Grammar, New-York, 1958.
55- LAURIE BAUER, English Word – Formation, New-York, 1983.
56- Valerie Adams, An introduction to Moder English, Word- Formation, London, 1982.